# شەوچەرەی دڵدار

## فەلسەفەی دین و خوو و ڕەوشتە بەرزەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

دانراوی:
مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس



| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | مدرس، عبدالکریم، ۱۲۸۳ - |
| عنوان و نام پدیدآور | : | شەوچەرەی دلدار/ دانراوی عبدالکریم مدرس. |
| مشخصات نشر | : | مریوان: امام ربانی: ، ۱۳۸۹. |
| مشخصات ظاهری | : | ۲۱۵ ص. |
| فروست | : | امام ربانی؛ ۴. |
| شابک | : | 978-600-90499-8-1 |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | شعر کردی -- قرن ۱۴ |
| رده بندی کنگره | : | ۳۲۵۶PIR/س۷۴۳م۳۵ ۱۳۸۸ |
| رده بندی دیویی | : | ۲۱/۹فا۸ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۵۴۳۴۶۶۱ |

# شەوچەرەی دڵدار

فەلسەفەی ئایین و خوو ڕەوشتە بەرزەکان
لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

دانراوی:
مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

انتشارات امام ربانی
مریوان

## پێشەکی

به ناوی خودای دەهندە و دلۆڤان

خوێنەری هێژا؛ کاتێک لاپەڕەکانی مێژوو هەڵئەدەینەوە دەبینین لـه دوای ئەوەی کە گەلی کورد بە قەناعەت و دڵنیایی‌یەوە هاتە ژێر سایەی چەتری ئیسلام و بوونە هەڵگری ئەو پڕۆگرامە مەزنە و سایەی شووم و تەمومژی نەگبەتی و چارە رەشی دوو زل هێزی ساسان و رۆم لە سـەر کـورد رەوی کرد، کوردستانی ئازیز بویە مەڵبەندێکی ئاینی و عیرفانی و نـاوەندێـکی بە هێز و پێزی ئیسلامی، تا ئەو جێگە کە هیچ سەر دەم و چەرخێک نەبووە کە لە پێشەوا و زانای کورد خاڵی بووبێ، بەڵکو سەدان زانا و گەورە پیاوی وا لەم گەلە هەڵکەوتووە، کـە هـەرکـام لـەوان لـە سـەردەمـی خـۆیدا شان بە شانی زانایانی گەلانی دیکە و بگرە پتر لەوان لە گـەشـە پـێدانی شارستانی‌یەت و زانستە ئیـسلامیەکانـدا دەورووە رۆڵـی گرنگـی خۆیـان گێڕاوە، وە بە دەیان مێژوو نووس و شەرع زان و فەرمودەنـاس و رێـزمان زان و قاریئی قورئانی وەک «ئیبنو ئەسیر» و «ئیبنو خەلەکان» و «ئامـێدی» و«موسەننیفی چۆر»و«ئیبنوسەلاح»و«ئیبنولحاجیب» و«ئیبنو جـەزەری»و... پێشکەش بە مێژووی ئیسلام و شارستانیی‌یەتی گەورەی ئیسلامی کـرد. جا یەکێک لەو ئەستێرە روونـاک و پرشـنگ دارانـەی ئاسـمانی زانـستی ئیسلام و مێژووی پڕ لە شانازی گەلەکەمان، زانای کەم وێـنە و نابیغـەی زەمان خواناس و ناو دار و ناسـراوو لـێهاتو موفـەسـسیر و شـەرع زان و مێژوونوس و ئەدیب و پسپۆر لە هـەر هـەمـوو زانـستە ئیـسلامییەکانـدا **(مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیسە)** کە سەد سالـی رەبـەق بـە قەڵەمی رەنگین و پشووی درێژی لە خزمەت بە دین و بە گـەل درێـخی نەکرد؛ وە هەر هەموو لاپەرەکانی ژیانی پڕ لە بەرەکەتی لە خزمەت بە دین

و گەلدا ڕەش کردەوە. هەر زانا و نووسەرێک کە لێی ورد ئەبیتەوە تەنها لە بوارێک یان چەند بوارێکدا پسپۆرو لێهاتو بووە، بەڵام نامی نەمر هەموو شتێک بووە. دڵنیام ئەگەر هەوڵ و تێکۆشانی مامۆستا نەبوایەت خوێنەری ئەمرۆی کورد لە زۆرێ لە مەیدانە جۆر بەجۆرەکاندا دەستەوسان دەما؛ جا خوێنەری بەرزو بە نرخ ئەم پەرتۆکەی بەردەستت شاکارێکی دیکەیە لە بەرهەمەکانی مامۆستای گەوەو سەروەرمان، کە بۆ یەکەم جارە بڵاو دەبێتەوە. مامۆستا لەم پەڕتۆکەدا هەندێ جار ئەزمونی ژیانی پڕبایەخی خۆیو دەوروبەری باس دەکات، خوا ناسی و خۆناسی و عیشقی بەڕاستی بۆ حەزرەتمان نیشان ئەدات؛ وەک دەرد شناس و دوژمن شناسێکی لێزان و لە کارزان دەرد و دوژمنمان بۆ دیاری ئەکات؛ لە زۆر جێگەدا هەستی گەل دۆستی و نیشتمان دۆستی و فەلسەفەی ئایین و ڕەوشتی جوان و پەروە-ردەی دینی و پابەند بوون بە مەزهەب و زەرەری بێ مەزهەبی و لە ڕێگە لادانمان بۆدەست نیشان ئەکات. بە کورتی ئەم پەرتۆکە بۆ کڕیار و خوازیاری خۆی دەبێتە خۆراکی گیان و ڕۆشنایی چاوان و مەشخەڵی ڕێگەی خوا ناسی.

### لێرەدا ئاماژە بە چەند شت پێویستە

**یەکەم:** هەروەک پێشترئاماژەمان پێدا ئەم پەڕتۆکە بۆ یەکەم جارە ئامادەی چاپ دەکرێت و بڵاو دەبێتەوە. بە هەوڵ و کۆششی بەڕێزان (مامۆستا مەلا یونسی وەیسی دزاوەری و مەلا حسەین کەریمزادەی کیکنی ) نوسراوەکەی مامۆستا ساغ کراوەتەوە و نووسراوەتەوە؛ بەندەش لەگەل ئەو بەرێزانەدا لە ئەووەڵەوە تا کۆتایی لەگەل دەس نوسەکەی مامۆستادا بەراورد و هەڵە گیریمان کردووە.

**دووەم:** وشە عەرەبییەکانمان لە سەر شێوەی ئیملای عەرەبی نووسیوەو لە بەین دوو کەوانەدا دامان ناوە؛ مەگەر لەو وشە و رستانەدا کە کـورد زۆر بەکاریان ئەهێنێ و رەنگی کوردی‌یان بەخۆوە گرتوە؛ ئەوە ئیتر مامـەڵـەی وشەی کوردی‌یان لەگەڵدا کراوە و لە سەر رێنووسی کوردی نووسراون.

**سێهەم:** بەپێی بواری گونجاو لە هەر شوێنێ پێویست بە راست کردنەوە یان گۆڕان کارییەک بوبێت راستمان کردووەتەوە و گۆڕیومانە؛ وە ئەگەر لە جێگەیەکدا ئایەتێک یا فەرموودەیەک وە یا وشە و رستەیەکی عەرەبی یـا کوردی نیازی بە ڕوون کردنەوە بووبێت لە پەراوێزەوە ڕوونمان‌کردووەتەوە و مانامان بۆ لێک داوەتەوە.

**پوختەیەک لە ژیانی مامۆستا :**

هەرچەند شوێنی لە دایک بوونی مامۆستا زۆر روون نییە بەڵام بە گوێرەی نوسراوەکانی خۆی، مامۆستا لە ئاوایی (تکیە)ی ناحیەی (سەید سـادق)ی ناوچەی شارەزوور چاوی بە دنیا هەڵهێناوە. هەرچەند کۆمـەڵـێک دەڵـێن هەندێ بەڵگە وا نیشان ئەدەن کە مامۆستا لـە ئـاوایی گوێـزە کوێـرەی نزیکی شاری مەریوان لە دایک بوبێ.

مامۆستا ناوی عەبدولکەریمە و کوری محەممەدی کوری فەتتـاحی کـوری سلێمانی کوری موستەفای کوری محەممەدە و لە بنەماڵـەی مـەشـهوری قازییە کە وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا لە ناحیەی(سەیید سادق)ی ناوچەی شارەزوور دانیشتون، مامۆستا لە ساڵی هەزارونۆسـەد و سـێ (١٩٠٣ز)ی هاتوەتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینی‌دا گەورە بووە، وە لە تەمـەنـی چوار پێنج ساڵیدا وەبەر خوێندن نراوە، لە ساڵی(١٩٠٧) کە تەمەنی چوار ساڵ بووە، باوکی کۆچی دوایی کردووە و لە سەر وەسیەتی باوکی و لە ژێر چاودێری دایکیدا درێژە بە خوێندن دەدات و لە لای گەورە زانایـانی ئـەو

سەردەمەی ناوچەکانی کوردستانی ئێران و عێراق زۆریک لە زانستەکـانی خوێندووە و بۆ دوا قۆناغەکانی خوێندنی ئەچێتە سلێمانی و لـە خانـەقـای مەولانا خالیددا بە خزمەت بەناو بانگترین زانای ئەو سەردەمـە ( مامۆسـتا شێخ عومەر ئیبنولقەرەداغی) ئەگات و ئاخرین پلەکانی زانستی عەقـڵی و نەقڵی ئەخوێنێ و بروا نامەی مەلایەتی و وانەبێژی لە لای ئـەو مـەزنـە زانایە وەرئەگرێت. پاش ئیجازە وەرگرتن ئەچێتە ئاوایی (نێرگسەجـار ) و بۆماوەی چوار ساڵ لەوێ ئەمێنێتەوە. پاش ئەوە لـە ساڵـی (١٩٢٨ز) لـە سەر داوای گەورە پیاوو مورشیدی ئەوسەردەمەی کوردستان حـەزرەتـی شێخ عەلائەددین بە پێشوازیەکی زۆر گەرمەوە لە تەمەنی (٢٥) ساڵـیدا ئەچێتە بیارە و ئەبێتە وانەبێژی ئەو مەدرەسەیە کە ناوەندێـکی بـە هـێزو پێزی ئایینی و عیرفانی وە گەورەترین زانکۆو فێرگەی ئـەو سـەردەمـەی کوردستان بووە؛ مامۆستا لە بیارەدا بۆ ماوەی (٢٣) ساڵ دەمێنێتەوە و پـۆل پۆل فەقێ لە کورد و نەتەوەکانی دیکە وەکوو عـەرەب و فـارس و تـورک دەهاتنە خزمەتی و بەهرەی بەرزی زانستییان لێ وەردەگـرت و لـە سـەر دەستی مامۆستادا بڕوا نامەی مەلایەتییان پێ خـەڵات ئـەکـرا . مامۆسـتا سەرەرای وانە بێژی، چەندەها فەتوای «فقە»ی وردوو چەندین پەراوێـز و تەعلیقات و لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەو کتێبە گرنگانە نووسیوە کە ئەو کـات خوێندنیان لە حوجرەکانی کوردستان و دنیای ئیسلامدا باو بووە. پاشان لە (١٩٥١ز)دا ماڵ ئاوایی لە بیارەیش دەکات و بەرەو سلێمانی کۆچ ئەکات لە مزگەوتی (حاجی حان) بە ناوی مودەڕڕیسەوە دائـەمـەزرێـت. لـە پـاش ئەوەی کە هەندێ کێشەو ناکۆکی بۆ دروست ئەبـێت دڵـی دەڕەنجـێت و سلێمانیش بەجێدێڵێ و دەچێتە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکوک. لەوێـیش بۆ ماوەی شەش ساڵ سەرقاڵی نووسین و وانە وتنەوە بـووە ( زیـاتر بـە مامۆستایانی کەرکوک) لە ساڵی (١٩٦٠ز)دا دەچێتە بەغدا و یەکەم جار لە

مزگەوتی «ئەحمەدی» بەناوی پێش نوێژ و خەتیبەوە دائـەمـەزرێـت. لـە ساڵی(١٩٦٤ز) دا دەچێتە بارەگای شێخ عەبدولقادری گەیلانـی و دەبـێتە وانەبێژ و پێش نوێژی ئەو بارەگایە؛ لەوبارەگا بەرز و پیرۆزەدا بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ ئەو گەورە زانایەی کورد کە دەریایە بوو لە زانـست کـۆڕی دەرس و فەتوای لە ئاسمانی هەر هەموو وڵاتـانی ئیـسلامیەوە دەنگـی دەدایـەوە و سنورەکانی تێپەڕ کرد و پۆل پۆل زانست خوازان لـە هـەمـوو وڵاتانـەوە دەهاتنە خزمەتی و بە پلەی بەرزی زانستی دەگەیشتن و بە کۆڵێ عیلمەوە دەگەڕانەوە زێدو مەڵبەندی خۆیان. مامۆستا بە درێژایی تەمەنی پڕخێر و بەرەکەتی سەرە رای تەدریسی ئەو کتێبە سەخت و گرانانەی(تفسیر، فقـە، اصول، کلام، حکمت، و ...) بە دەوام خەریکی نووسینو کتێب دانان بـوو. لە ساڵی(١٩٧٤ز) کراوەتە سەرۆکی رابیتەی عولـەمـای عـێراق و دواتـر بووەتە موفتی هەر هەمو عـێراق. و ە لـە ساڵـی (١٩٧٨ز)تـاکۆچی دایـی کردووە ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراقیش بووە. ئەم زانا پایە بەرزوو ماندوو نەناسە دوای تێپەڕ بوونی زیاتر لە (١٠٣)ساڵ تەمەنی پڕ خێر و بەرەکەتی، وە ئیجازەدان بە سەدان زانا لە کورد و غەیری کورد وە نووسینی زیاتر لە سەد کتێب بە هەر سێ زوبانی عەرەبی و کوردی و فارسی لـە رێـکەوتـی ( ٢٩ / ٨ / ٢٠٠٥) ی زایینی رۆحی بەرزی بە لیقای پەروەردگار شاد بوو .

**فسلام علی«نامی»یوم ولد و سلام علیه یوم مات و سلام علیه یوم یبعث حیا**

جەمیل ئاشنا

رێبەندانی ساڵی ١٣٨٩ ش

مەریوان: مزگەتی حەزرەتی عەلی

بسم الله الرحمن الرحيم

حەمد و سەنا

بـەنـاوی خـوای خـاوەن ئیـسمی زات
(الله) جـامیعی ئـەسـراری سـیفات
خودای بەخشەنـدەی جیهـان ئافـەریـن
خـاوەن رەحمـەتـی عـامی دنیـا و دیـن
خودای میهرەبان لـەگـەڵ خـاس و عـام
خـاوەن وەسـیلەی ریـسالەی ئیـسلام
خـودای کامـڵی (واجِـبُ الوُجـوذ)
پـەروەردگـاری عالـەمـین بـەجـوود
مەعبوودی بەحـەق لـەبـۆ مـەوجـوودات
بەیاسای مەشرووع بـە تـەسـبیحی زات
خـودای سـەراسـەر چـەرخـی رۆزگـار
لەبەرزی و پەسـتی وشـکی و دەریـا بـار
چـەرخـی دەوواری بـاری موعتـەدیـل
لـە سـەرمـەداری بـاری موعـەددیـل
چـەرخـی مـائیلی جنـوب و شـیمال
لـە روی ئـاوایی خـاوەن مانـگ و سـاڵ
چـەرخـی هـەڵ سـوڕا و ئاسـیا و ئاسـا
ساڵ یەک شـەوو رۆژ بـە یاسـای رەسـا
خـودای بـێ نیـاز لـەعالـەم بـە عـام
(مُطیـع)یـا(عاصـی) (کـافر) یـا(ئیـسلام)

هــەرچــی وتــراوە لــە ســەنــای زاتــی
ناگــا بــە بــازێ جیلــوەی ســیفاتی
هەرچی وتــراوە بــە شــێوەی مــەقــسوود
فائیــدەی (فــرد)ە لــە ســەنــای وجــوود
خــودایێ وابــێ مــەگــەر تــەنیــا خــۆی
ســەنــا و ســتایش دەرببــڕێ لــە بــۆی
هەرخۆی حامیدە و هەرخۆی مــەحمــوودە
چوون (نِعَمــاتِ)[1]ی غــەیــرە مــەحــدوودە
درودی بــێحــەد بــۆ رەهبــەرانــی
یــانی بــۆ هــەمــوو پــێغەمبــەرانــی
خوسوس سەرحەلّقەی رشتەی رەهبەران
(سیدالرُسُــل) شــای پــێغەمبــەران
موحەممەد، ئەحمەد، مەحموودی مەسعوود
خــاوەنــی پایــەی مــەقــامی مــەحمــوود
کە بوو بە ســایەی رەحمــەت بــۆ عالــەم
کە بــوو بــە مایــەی نیعمــەت بــۆ ئــادەم
نــووری گــەیــشتە فریــشتە و پــەری
دای بــە ئــادەمــی ســایەی ســەروەری
بوو بە مایەی عــەقــل بــۆ عیلمــی عــالِم[2]
بوو بە مایــەی فــەزلّ بــۆ ســینەی ســالم

---

[1] نعمات (جمع)ی نیعمەتە واتە : لە بەر ئەوەی نیعمەتەکانی لە ژمارە نایەن
[2] – لە نوسخەکەی مامۆستادا عالەم نووسراوە بەلاّم بەگوێرەی مەعناو وەزنی شیعرەکەی ئەبێ(عالِم) بێت

(مَبْعُوث)[١] بە رەحمەت لەبۆ عالەمین
پڕتەودەر بە ڕووی سەما و سەر زەمین
هەم لەسەر هەرکەس بەیەکەم پایە
بە نووری ئەو بوون بە خاوەن سایە
ئالی نەسەب و حەسەبی دینی
هەمو یارانی خاوەن تەمکینی
سەنای ئەوانە بە یاسای میقیاس
(خَیْرُأمةٍ أُخْرِجتْ لِلنّاسْ)[٢]
هەم لەسەر هەموو پەیڕەوەکانی
هەموو زەمان و هەموو مەکانی
تا هەتاو ئەدا ڕۆژ لە ئەختەران
هەتا ئەبارێ بە رەحمەت باران
ئەمجار براکان ببن ئاگادار
وادەرچوو خوانی شەوچەرەی دڵدار
یانێ شەوچەرەی شیاوی یاران
لە بیری پاکی گەلی هۆشیاران
سەراسەر نوکتەی پڕ لە ئیحسانە
شایاوی[٣] فامی دڵی ئینسانە
زوو وادەم پێدان بە وادەی مەردان
بۆ برایانی هاوحاڵ و دەردان

---

[١] – نێرراو، رەوانە کراو

[٢] – ئاماژەیە بەو ئایەتەی قورئان کە ئەفەرموێت : ئێوە ئەی ئۆممەتی محەممەد ﷺباشترین کۆمەڵن کە بۆ (سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە (آل عمران ١١٠)

[٣] – بە مانای شیاوە

پێشکەشتان ئەکەم وا کە بگەوێ
بۆ دڵتان ببێ بە هۆی پڕتەوێ
خۆشتر لە بادام باسق و هەنجیر
لە قەیسی و لە قۆخ شایستەی دڵگیر
مێوژ و کشمیش گوێز و تووی شیرین
پەروەردەی دەستی نازاری نەسرین
ئەم ناوانیشە وێنەی میسالن
مەبەس بەرهەمی فیکر و خەیاڵن
ئەوەی کە مایەی فەوزی عیززەت بێ
بۆ مەزاقی دڵ خاوەن لەززەت بێ
ئەگەرنا ئەوەی بەشی خۆراکە
ناگاتە ئەوەی بەشی ئیدراکە
ئێمە مەبەسمان تەمێ و تالیمە
لە بۆ ئەو کەسە عەقڵی سەلیمە
حەواڵەمان کرد بە وێنەی سەعدی
روومان کرد لە حەق بە یاسای مەردی

## شەوێ لە رشتەی رۆزگارانا

شەوێ لە رشتەی رۆزگارانا
باسێ هاتە ناو لەناو یارانا
یەکێ وەهای وت کە ئایین کاری
لەسەرعادەتە بە یاسای جاری
یەکێ زیندیقە و مەشرەب وجوودی
لەسەر گومڕاهی فیکری جحوودی

یەکێ ڕۆژ پەرست یەکێ ئەستێرە
یا ئاگر پەرست لەو دەور و دێرە
یەکێ تەبیعی (عَناصِر)[١] جۆیە
یەکێ مەنازیر بۆ ڕەنگ و بۆیە
یەکێ جولەکەی یەهوودی ڕشتە
یەکێ نەسڕانی(صلیب) سوروشتە
یەکێ موسوڵمان لە ئەهلی سوننەت
یەکێ لە شیعەی عەلەوی نیسبەت
(علی اللّهی) یا خود (نُصَیری)
یا (سیّد) ڕۆستەم وا لە (هودەیری)
یا لە(سەنجاری) یەزیدی مەشڕەب
یا خەواریجی تەریک لە ئەدەب
هەموو ئەمانە و وێنەی ئەمانە
شاگردن لە بۆ یاسای زەمانە
هەرچی وەربگرن کاتی منداڵی
ئەبێ بە ئایین بۆ گەورەساڵی
ئیتر بیری من حەیرانە و ماتڵ
لە تەفاوتی حەق لەگەڵ باتڵ
یانێ کاروان وا یێتو ئەڕوا
ئاگادار نییە بەری لە دوا
کە ئەم وتارەی دەرچوو لە ناو دەم
لەناو یارانا بوو بە مایەی خەم

[١] (جمع)ی (عنیر)ە واتە: توخم، ڕەگەز

یـــەکـــێ لـــە یـــاران عاقـــڵی هۆشـــیار
هـــاتـــە دەنـــگ وتـــی ئـــەی بـــرای دڵـــدار
واتـــەکـــەت هـــەرچـــەن زاهیـــر واریـــدە
دوورە لـــە فیکـــری ئـــەوەی ڕاشـــیدە
تـــۆ ئـــەگـــەر ســـاتێ بیـــر بکـــەیتـــەوە
بـــەم دەردە پیـــسە ناتلـــێی تـــەوە
بـــەم عـــادەتانـــە ســـەرگـــەردان نـــابی
بـــۆ ئـــایینی حـــەق قـــەت حـــەیـــران نـــابی
حەق هەر یـــەکێکە قـــەت نـــابێ بـــە دوو
ڕێگەی حەق ئەگریی و ئەڕۆی زوو بە زوو
چونکـــە ئـــەمانـــە تـــۆ باســـت کـــردن
لـــە ڕۆزگـــارا ئیحـــساست کـــردن
یـــا هـــەمـــوو حـــەقـــن لـــە ڕۆزگـــارا
یـــا خـــود بـــەتاڵـــن لـــە نـــاو ئـــەفکـــارا
یـــا بـــازێ حـــەقـــە و بـــازێ بـــە تاڵـــە
لـــەمـــە زیـــاتر بـــێ ئیحتیماڵـــە
یـــەکـــەمـــین دورە لـــە قبوڵـــی زەیـــن[١]
چونکـــە مـــەحاڵـــە(جَمْـعُ النَّقیـضَین)[٢]
نـــابێ دووهـــەمـــیش پـــێ بنـــێته بـــەیـــن
چـــونکی مـــەحاڵـــە(رَفـعُ النَّقیـضَین)

---

[١] - بیر، هۆش
[٢] - کۆکردنەوەی دوو شتی دژ بە یەک

هـەر ئاخریانـە ئـەشـێ بـۆ تـەسـدیق
ئـەگـەر تـەوفیقـت بـبێ بـە رەفیـق
ئەمجارە تـەوفیـق پـێتئـەڵـێ بورهـان
بـۆ راسـتی بـازێ و بـۆ لاری ئـەوان
ئـەو دەلیلانـە بـبن بـە بورهـان
لەلای خاوەن هـۆش عـەیـانن عـەیـان
یـەکـەم ئیـستیدلال بـە هـۆی ئاسـارە
کـە (مُـؤثر)یـان لـێوە دیـارە
ئاسـاری بـەدیـع لـەگـەڵ ئیـستیمرار
دەلـیلی راسـتە بـۆ پـەروردگـار
بـێ موئـەسـسیری زانـای تـەوانـا
بوونـەوەر نـابێ زانـا و نـەزانـا
موئـەسـسیر بـەبـێ ئیـرادە و دەسـتوور
دانامـەزرێـنێ جیهـانی پـڕ نـوور
ئـەم حـەقیقـەتـە ئـەزانـێ تـەواو
ئـەگـەر عـەقـڵی تـۆ پـێ بنـێتەنـاو
تەبیعەتی رووت بـێ عـەقـڵ و شـوعوور
چۆن ئەبـێ بـە هـۆی نیـزام و دەسـتوور
ئـەگـەر(عَـرَض)ە موحتاجـە بـە غـەیـر
ئـەگـەر (مُمکِـن)ە باشـی بکـە سـەیـر
مـادام (مُمکِـن) بـێ ئـەوە موحتاجـە
موحتـاج بـۆ موحتـاج دوورە عیلاجـە
ئـەگـەر (واجـب)ە واهاتیتـە سـەر
فکـرە راسـەکـە (الله اکبـر)

تـــەبیعـــەت نییـــە ئـــەوە خودایـــە
پـــەروردگـــاری گـــشت (ماســـوا)یـــە
(صُـدفە)[١]یش بـەتاڵـە لـە رووی جیهانـا
بـێ سـەبـەب نییـە (مُمکِـن)لـەشـانا
سـەبـەب (مَجهـول)ە یـانێ پـەنهانـە
موسەببـەب لـەلات عـەینـەن عـەیانـە
عـەقـڵی موهـەززەب بـێ ئـەدەب نـابێ
هەرگیز موسەببەب بـێ سـەبـەب نـابێ
وجـــوودی(صُـــدف)ەی ئـــەم کائیناتـــە
مـــەهـــزەلـــەیـــێکە[٢]، لـــە خوڕافاتـــە
نـــانێ مـــەحاڵـــە بـــێ نانـــەوایـــێ
چـۆن جیهـان ئـەبـێ بـە بـێ خـودایێ
هـەڵـدە لـە بیـری تـاریکی نـەفـام
هـەر بیـری رۆشـن ئـەگـا بـە مـەرام

**بونەوەر پێویستی بە بەدیهێنەرە**

جیهـــان ئـــەیـــەوێ جیهـــان ئافـــەریـــن
زینـدوو بـێ و زانـا و تـەوانـا و بـەتـین
هـەرچـی مـەوجـوودە لـە رووی جیهانـا
لـــە ســـەر زەمـــین و لـــە ئاســـمانا
هـــەمـــوو مـــەخلـــوقی پـــەروەردگـــارە
رامـــی قـــودرەتـــی خـــوای قـــەهـــارە

---

[١] – رێکەوت
[٢] – شۆخی، گاڵتە

وەکـو بـۆ (حُـدُوث)[1]موحتاجـە بـە حـەق
لــە بــەقایــشدا موحتاجــە موتــڵەق
ئــەوا ســابت بــوو (واجِــبُ الوجــود)
بۆ خەلقـی (ممکـن)غائیـب و مـەشـهوود
کـە خـودات ناسـی وەحـدەتـی فـەرزە
(تَعَــدُد)مایــەی فــەســادی عــەرزە
بــەڵــکو وەسـیلەی فـەسـادی عامــە
هــەر یــەکیــەتییــە هــۆی(انتظامــە)
کـە خـودا یـەک بـوو بـۆ هـەمـوو عالـەم
پێویـستە دەسـتوور بـۆ جـەمعـی (اُمَـم)
یــانێ نــاردنی شــەریعــە و رەهبــەر
لـە بـۆ هوشـیاران عومـوومی یـەکـسەر
(نظــام) و یاســا بــۆ عالــەم فــەرزە
(نظـام) پیـرۆزی سـەمـا و سـەر عـەرزە
شــەریعــەت یاســای پــێغەمبــەرانــە
خــەڵاتــی خــودای (حــیَ مَنّانــە)
دەعوای شـەریعـەت کـە هاتـە مـەیـدان
(مُعْجِــزە) فــەرزە بــۆ پــێغەمبــەران
(مُعْجِـزَە) کـارێ ئوممـەت پـێی نـەکـرێ
دەعوای (رسـالت) بـەو تـەرویـج ئـەدرێ
(مُعْجِــزَە)ی رەهبــەر مایــەی (تــصدیق)ە
بـۆ ئـەهلـی شـوعوور مایـەی تـەوفیقـە

[1] - پەیدا بون

(مُعْجِزَە) وەهبــە نــە کــەســبە و نــە فــەن
بە وێــنەی ســیحر و جــادووی ناپــەســەن
کــە(مُعْجِــزَە) بــوو بــە وەســیلەی فــەرق
نــووری رەهبــەران ئــەروا وەکــو بــەرق
لــەم دڵ بــۆ ئــەو دڵ دڵــی موســڵمان
دڵــی ئینــسانی بــە عــەهــد و پــەیمــان
دڵان دائــەگــرێ ئــەو برقــی نــووره
ئەو نــوورەیــش مایــەی پایــەی(حُـضُوْر)ە
ئــەو نــووره ئــەبــێ بــە چــرا بــۆ دڵ
عالــەم دائــەگــرێ مــەنــزڵ بــە مــەنــزڵ
ئیتــر هــەرکــەســێ شــەرعــی گرتــەبــەر
دوور ئــەبــێتەوە لــە مایــەی خــەتــەر
ئیتــر مــەڕوانــن لــەبــۆ بــەدبــەختــان
بــۆ بــێ نیزامــان یــانێ ســەرســەختــان
لــەبــۆ ئــەوانــە ئــەژیــن بــێ مایــە
پایــەی (شــرائع)[1] لــەلایــان بایــە
بــڕوانن لــەبــۆ ئــەســحابی بوڕهــان
(صــاحِبِ البُرْهــان قَطْعــاً لا يُهــانْ)[2]
دەلیلــێکی تــر بــۆ ڕاســتی ئــایین
یاســای قورئانــە قورئــانی (مُبــین)

[1] – (جمع)ی (الشريعه) یە بە مانای: دەستور و یاسایە، ئەو یاسایەی پەروەردگار بۆ بەندەکانی داناوە
[2] -- خاوەنی بەڵگە بە هیچ شێوەیەک سووکایەتی پێ ناکرێ

عالـەم بانـگ ئـەکـا بـۆ دینـی تـەوحیـد
بـۆ یاسـا و (نظـام) بـۆ خـولقی رەشـید
بۆ (عدل) و (احسان) بۆ (صِلَه)ی ئـەرِحـام
بۆ(رحم) و (انصاف) لەگەل (خـاص) و (عام)
بۆ (صدق) و بۆ (صـبر) بـۆ یاسـای ئـەدەب
بۆ بەرزی (اخلاق) بـۆ (حُـسن)ی(حَـسَبْ)
دەلیلـــێکی تـــر خـــولقی رەهبـــەرە
ئـەو خولقـە مایـەی بـەرزی بـەشـەرە
ئـەو خولقـە قورئـان تـەفـسیرە بـۆ ئـەو
کـە قورئـان پـڕە لـە نـوور و پڕتـەو
ئـەگـەر بـە ئینـساف بـڕوانی لـەبـۆی
شـوبهـەت نامـێنێ لـە یاسـاکەی خـۆی
بەوێـنەی هـەتـاو دەرکـەوت بـۆ عالـەم
بـێ فـەرق و فـروق (مَبـدَء) تـا (خـاتَم)
کـە خـولقی لـەلای خـودا پـەسـەن بـوو
یانی ئەو خولقـە خـولقی ئـەحـسەن بـوو
ئـــەمانـــەت زانـــی بـــۆ دائـــەمـــێنی
بـــە ئیحتیمـــالات خـــۆت ئـــەمرێـــنی
ئـــەخلاقـــی رەهبـــەر تـــۆمی ئیحـــسانە
بـــەزری شـــایاوی بـــەرزی ئینـــسانە
راســـتە نامییـــات تـــابیعی تۆمـــە
پیـوەنـدیش رەغبـەی عـەجـەم و رۆمـە
شـــاگردی مـــەردان گـــەورە شـــاگردە
شـــاگردی نامـــەرد ئـــەڵـــبەت نامـــەردە

گـــەل بـــە منداڵـــی وێـــنەی منداڵـــە
چـــوون تالیمـــت کـــرد وا خـــاوەن حاڵـــە
لەلای گـەلـێ کـەس سـیر بـێنی خۆشـە
بـــێنی وەنـــەوشـــە بـــەدە و ناخۆشـــە
شـــەلـــەم شـــیرینە و کرمـــان ئـــەکـــوژێ
زاروو بـــە حوججـــەت خوێـــنت ئـــەمـــژێ
هـــەرکـــەس بـــە دەردێ ئـــالوودە بـــێ
لـــەســـەر(تأویـــل)ی ئاســـوودە ئـــەبـــێ
قەت عادەت نـابێ بـە مایـەی تـەحـسین
لـەبـۆ ئـەخلاقـی سـووکـی ناشـیرین
چـــونکێ دیـــارە شـــیرین شـــیرینە
عەنبەر عـەنبـەرە و نـەسـرین نـەسـرینە
لـە سـەر بـەداهـەت شـارەزا ئـەبـێ
بـە ئـەنجـامی حـەق دڵ رەزا ئـەبـێ
شـەریعـەت ئـەڵـێ حـەقیقـەت وایـە
ئیعتیـراف بـە حـەق مایـەی سـەفایـە
کـێیـە کـە ناکـا فـەرقـی حـەیوانـات
لـە گـەل ئینـسانی خـاوەن کـەرامـات
چۆن فەزڵـی بـەشـەر لـەسـەر هـەوایـە
چـۆن نیزامـی حـەق بـە بـێ خودایـە
کـەشـتی لـە دەریـا نـاخودای نـەبـێ
کێ ئەڵێ سەیـری رووی دەریـای ئـەبـێ
چـۆن ئـەبـێ ئـادەم مـەسـئوولی نـەبـێ
لە کـەسـب و کـارا مـەحـسووڵی نـەبـێ

ویجدان لەم باسا بە حەق حاکمە
هەر خودا پەرەست لەشەڕ سالمە
گاوگۆلک پەرست ئاگر و هەتاو
کەی لەگەڵ عاقڵ سەرئێنن بۆ ناو
کەی نەخۆش ئەبێ بە خاوەن تەئسیر
کەی بێ هۆش ئەبێ بە خاوەن تەدبیر
ئەشرەفی مەوجوود ئینسانی ژیرە
ئەویش لە چاری خۆیدا زویرە
دوکتوری دەوای دەردی خۆی نەدا
چۆن بۆ نەخۆشان فائیدە ئەدا
ئەگەر تێ فکری بە بیرێکی جوان
حەق هەر یەکێکە نابێ بەدووان
ماوەتەوە بەس شوبهە و خەیالات
بۆچی وا بەشەر کەوتە (ضلالات)
وەڵامی ئەمە گەلێ ئاسانە
ئەگەر ئینسافێ لەناو دڵانە
کە حەق یەکێ بوو بۆ راگرتنی
سوڵتانی ئەوێ بۆ پاراستنی
کە سوڵتان نەبوو شەیتان حازرە
نەفسیش لە بۆ ئەو بەندەی چاکرە
هەوایش (مرکب)ی نەفس و شەیتانە
بە مەلە ئەیبا بۆ ئەو شەتانە
هەتا ئەخنکێ بە گێژی دەریا
مەگەر سادەرچێ ئینسانی وریا

بابەس بێ کەلام مەعلوومە لەلام
عەقڵ چرایە بۆ دینی ئیسلام
(نامی) ئەم باسەی گێڕاوە بۆتان
هەتا حەقیقەت دەرکەوێ لێتان
رەحمەت لە (نامی) و لەوەی دڵ ئەگرێ
هەرکەس گوێ گر بێ بە سەفا ئەمرێ

**تەریقەت چییە؟**

پێم بڵێ لەپاش ئیکمالی ئایین
تەریقەت چییە بەعەلاوەی دین؟!
برام تەریقەت بەڕووی حەقیقەت
هەر عەینی دینە و عەینی شەریعەت
مەعنای تەریقەت رەبتە لە گەڵ دین
لەسەرسوننەتی (خیرالمرسلین)
یەقین حەزرەتی رەسولی ئەمین
(مَبعوث) بە رەحمەت لە بۆ عالەمین
پاک لە رەزیلەی خاسەی نەفسی بوو
خاوەنی نەفسی پا کی قودسی بوو
مادام نەفسی ئەو وا(مُزَکّی)بوو
فیعلو تەرکی ئەو لەبەر خودا بوو
دڵی مەرکەزی کارەبای نوور بوو
خاوەنی پایە و مایەی (حُضُور) بوو
یارانی بەرزی بەخوسوس (خُلفا)
تالیب بوون لە بۆ سەفای (مصطفی)

ویستیان لەسەر ئەخلاقی ئەو بن
لە ئیتتیباعا میسداقی ئەو بن
جوهدیان ئەکرد لەگەل ئیمکانا
پەیڕەوی بکەن لە هەموو ئانا
بازێ بە (حُضُور) بە زیکری (سِرّ)ی
بازێ بە شعوور بە زیکری (جَهر)ی
تا بە پەیڕەوی بوون بە چرای نوور
بە نەجمی هودا بۆ نزیک و دوور
خوسوس(خلفا)بوون بە خەلیفەی
لەسەر حەقیقەی میللەی حەنیفەی
بوون بە مەرکەزی (حضور) و (شهود)
بوون بە عیبادی خالیسی مەعبوود
بەم جۆرە حاڵەگەلێ لە ئەسحاب
دڵ مونەووەر بوون بێ حەد و حیساب
وا هات ئەم حاڵە گەییە تابیعین
(رَضِی اللهُ عَنهم أجمعین)
پاش تەرکی حەرام پاش ئەدای واجیب
لە پاش تەتبیقی ئیعلای رەواتیب
(تَقَرُّب)یان کرد لەسەر (نَوافل)
بۆ ڕەزای خودای خاوەن(فضائل)
لەگەڵ تەزکییەی نەفسی ئەممارە
لە (رَذائل)[1]ی مایەی خەسارە

---

[1] - جەمعی رزیلە - پیس و پۆخڵ

هـەتـا تـێگەیـین لـە مـەعنـای ئیـسلام
هـەتـا پـێگەیـین بـە بـەرزی ئـەعـلام
جـا وا مـەزانـن ئـەم کـارە سـووکە
بـەڵـکو پێویـستی سـەیـر و سـلووکە
سـلووکی راسـتی لـەگـەل ئیخلاسـا
لـەگـەل نیزامـی زومـرەی خـەوواسـا
لـەسـەر ئیلتیـزام لـەبـۆ عـەینـی دیـن
زاهیـر و بـاتین بـە یاسـای تـەمکـین
لـەگـەل ئیحتیـراز لـە چـارەی (آفِـلْ)[1]
وەکـو خـەلیلـی (شَـیخُ القوافـلْ)[2]
یـانـێ بـە یاسـای جوملـەی (مـازالَ)
(عَبـدی) کـە(مَـرْوی) لـە لایـەزالـە[3]
ئـەم حاڵـە رووی‌دا لـەبـۆ دڵـداران
بـۆ خـودا پـێدا و لـە بـەختیـاران
جـا لـەسـەر یاسـای (واتّقُـواللە)
(ویُعَلمکُـمْ) بـەو (اِتّجـاه)[4] ە
بـوون بـە (مُقْتـبس) لـە نـووری رەسـول
بوون بە زەڕەبـین بـۆ شـوعلەی (وُصـول)

---

[1] – شتێ دەوامی نەبێ، لاچوو، ئاوابوو؛ ئیشارەیە بە ئایاتی ٧٤تا٧٦ لە سورەی ئەنعام

[2] – مەبەستی حەزرەتی ابراهیمی خلیل اللەیە

[3] – ئیشارەیە بەو حەدیسە قودسییە کە ئیمامی بوخاری بە رەقەمی(٦٠٢١) ریوایەتی کردووە

[4] – ئێوە لە خوا بترسن خوایش لە زانست و راستییەکان ئاگادارتان ئەکا بە شێکە لە ئایەتی ٢٨٢ سورەتی بقرە

ئــەو نــووره کــاتێ گــەییــشتە دڵــیان
نــوورانی ئــەبــوو مــاڵ و مــەنزڵــیان
ئیلهامیــان کــرا بــە چــەن ئیلهامــات
بــوون بــە خــاوەنــی بــارەی کــەڕامــات
لــەم ئــەشخاسـانە سـەلـەف و خـەلـەف
گەلــێ دەرکــەوتــن ئــەســحابی شــەڕەف
چــوار یــارەکــان خــاوەن نــووری دیــن
خاوەن (شُـهود)ی مـەرتـەبـەی یـەقـین
(ســلمان) و (قاســم)( جعفــری صــادق)
ســاحیب( فیوضــات) خــاوەن حــەقــایق
(حسن)ی بەسری (حـەبیـب)ی شـەریـف
(داوود)ی تــایی (لائــق) بــە تــەشــریف
(معروف)ی کەرخی بـە سـەفـا مـەعـروف
(سَریَ) و (جنید)ی بـە وەفـا مـەوسـووف
هــەروا وێــنەیــان لــە حیــساب نایــە
چــونکی فــەیــزی حــەق بــێ ئینتیهایــە
هــەتــا هــاتــە خــوار چــەرخــی زەمانــە
بــاش‌تــر دەر ئــەکــەوت نــووری ئــەمانــە
چونکــە هــەتــا شــەو لــە زولــمەت تــێرە
زیــاتر دیــاره نــووری ئــەســتێره
ئــەوانــە وەهــا بــوون بــە ساحــێب حــاڵ
تەقوایــان گــەیــشت بــە پایــەی کــەمــاڵ
ئیلهامیــان ئــەکــرا بــە حاڵــی (رجــال)
بۆ زیکــر و فیکــر و تــەزکییــەی ئــەحــواڵ

هەرکەس بە یاسای ئیلهاماتی خۆی
ڕێگەی تەربیەت (واضح) ئەبوو بۆی
ئەتباعی خۆیان وا تەعلیم ئەکرد
فەیزی ڕەحمەتیان وا تەسلیم ئەکرد
بە زیکر و فیکر و (تسبیح) و (تهلیل)
بە موراقیبەی زاتی بێ (مَثیل)[١]
ئەوانەیش هەموو عەینی تاعەت بوون
هەمو بە یاساو ڕێی شەریعەت بوون
خەڵوەت و چلە و ( صَوم) و (تَهَجُّد)
لەگەل ماباقی نەوعی (تَعَبُّد)
ئەگەر کارێ بوو وێنەی بێگانە
بزانە ئەوەیش فەرعی ئەوانە
جەڕاحی ئەگەر لە بۆ سیححەیە
لە میحنەت نییە بەڵکو مینحەیە
کەس خەیاڵ ناکا لە ئیسلام دوورن
بەڵکو لە ئیسلام قەبەسێ نوورن
یەک یەک بەڕاسی داخڵی دینن
فرووعی دینی شای (مُرسلین)
بەڕاستی ئەگەر تۆ حەقت ئەوێ
بێ حزووری دڵ دین دەس ناکەوێ
یانێ تەریقەت بە ئیلتیزامە
بۆ ئەو مینهاجە ناوی ئیسلامە

---

[١] - بێ وێنە

تەریقەیش لەبەر کەسبی (حضور)ە
حزووره بۆ دڵ جالیبی نووره
ئیتر تاوانی ئەتباعی نابار
ناچێتە ملی ئوسوولی ئەبرار
خودا یەکێکە قادیر و قەههار
ئادەمی زۆربەی (عاصی) و تاوانبار
ڕەهبەر یەکێکە ساغ و سالمە
لە دین لادەریش عاسی و زاڵمە
پیشەوا کانمان هەموو ئیمام بوون
خاوەن علووم و عالی مەقام بوون
کە چی خەلەفیان خاوەن خیلافن
گەلێ دوور لە خوی عەقڵ و ئینسافن
بەچکە مەلاکان مەلە نازانن
خەڵکیش هەر ئەڵێن کە مەلەوانن
بەچکە شێخەکان بە ناتەواوی
خەڵکیش بە وانە ئەڵێن مراوی
گوناهی گرۆی ئەتباعی نامەرد
ناچێتە شانی مەردی جەوان مەرد
(تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ)[1] بێنە
سەفای دڵی خۆت بە حەق بستێنە

[1]- ئەوان ئۆممەتێک بوون کە رۆیشتن بە خۆیان و کردەوەی چاکیانەوە بەشێکە لە ئایەتی١٣٤ی سورەی (بقره)

قورئـــان کافیـــه (لوکـــانَ عُـــرْفُ)
(فَخَلَــفَ مِــنْ بعــدِهم خَلــفٌ) [١]
(مــع العلــم) ئــەگــەر ناحــەقــێ دەرچــوو
لــە بــێ نیزامــی عالــەم پــەیــدا بــوو
ئەگەر یاسای دین بــه حــەق (مَرْعِــی)بــێ
کــاری ناهــەمــوار نــابێ شــەرعــی بــێ
بــدە لــە دەســتی یــارۆی تاوانبــار
تا تــەمــێ بگــرن خــەڵــکی لادێ و شــار
خــەتــای ئیهمــالی یاســادارانه
ئیمامــەت بــۆ ئــەم تــاوان بارانــه
بیــساتی عالــەم دەرچــێ لــە (نظــام)
ساڵــێکی ئــەوێ عــەودی(انتظــام)
نــەک نیزامــی دیــن نیزامــی دنیــا
حیمایــەی ئــەوێ و ئینــسانی وریــا
کــه گــەورە و بچــووک نــەمــا لــە مــاڵا
ئاســاییش نــابێ لــە نــاو منــداڵا
قورئــان بــە بــەرزی دەســتووری عامــه
ریعایــەی ئــەوێ مــادام نیزامــه
(نظــام) خــۆ بــە خــۆ نــاڕوا بــە ڕێــدا
حــاکیمی ئــەوێ لــە شــار و دێــدا

---

[١] - واته له دوای ئەوان کەسانێک له نەوەکانیان بونه جێ نشین که نوێژەکانیان بەزایه داو شوێنی ئارەزووەکانی نەفسیان کەوتن- ئایەی ٥٩ مریم

(نـــامی) وەهایـــە بـــە راوردی ئـــەو
خۆشی نیزامـە و نـەک هـەرا و هـەو هـەو

## عەشرەت ئامانە

عەشرەت ئامانە لـە دەسـتی وە سـواس
دوژمنی دینە مـەخـسوس بـۆ (خَـوّاص)
ڕێـگەم لـێ ئـەگـرێ لـە شـەو و ڕۆژا
لـــە نـــزارا بـــم یـــا لـــە بـــەرۆژا
بە فیکری شـتێ کـە هـەرگیـز نـەکـرێ
یـا شتـێکی وا کـە جـێگە نـەگـرێ
لـە نوێـژا ئـەڵـی بـڕۆ بـۆ بـازار
لـە کـاتی سـاغی بـۆ دەوای ئـازار
لـە کـاتی پیـری خـەیاڵـێکی وا
بـە جـوان نـەکـرێ لـە جۆشـی تـەوا
دۆستی بـێ غـەشـم ئـەکـا بـە دوژمـن
دوژمنـی کـەوە بـە دڵـداری مـن
جارێ شەرتم کرد قەت خەیـاڵ نـەکـەم
ئارەزووی کـاری سـەربـەتـاڵ نـەکـەم
باشـتر لـە جـاران دێـتەوە سـەرم
فیکرێـکی نابـار ئـەخاتـە بـەرم
قـەت دوژمنـی وا دیـاری و پـەنامـە
نەبـوە ڕەنگـا و ڕەنـگ وەکـوو دێـوجامە
هەرسات بەجۆرێ خـۆی دەرئـەخـا لـێم
هەرکـات بـە دەردێ پـەنـدێ ئـەداپـێم

بە چەن وەسوەسەی بێ ئەسڵ و ئەساس
مەکروە لای خودا و لای خەڵکی حەقناس
بـە بیـری پایـە و مایـەی بـێ سـەمـەر
بە فیکری غایـەی سـەد لـە سـەد زەرەر
ئـەو( الخنّـاس)ی وەسواسـە کـە هـات
بـە جـارێ دڵـم بـاش داگیـر ئـەکـات
وکــو زۆر دارێ داخــڵ بـــێ بـــە مـــاڵ
جێگە تەنـگ بکـا لـە ئـەهـل و عـەیـاڵ
لە بـەر ئـەم دەردە چوومـە لای مـەردێ
ژیـــر و ئاگـــادار بـــە بـــەراوردێ
داوای دەوام کـرد لـە بـۆ دەردی خـۆم
بـەڵـکو دەرمـانێ مـەعلـوم بکـا بـۆم
وتـــی دڵ خـــانووی خـاوەن دەرگایـــە
پاســەوانــەکــەی عــەقــڵی ئاگایــە
ئینجـا هـەرکـەسـێ دەرگـا دانـەخـا
دز و درۆزن ســـەری تـــێ ئـــەکـــا
بە دەسـت و بـە دەم زیـان ئـەدەن لـێی
تا خۆشـیی ژیـان حـەرام ئـەکـەن لـێی
دڵ گــەنجینــەیــە شـایاوی سـەیـرە
مەنبـەعـی فـەیـزی ئـەنـواری خـەیـرە
کـە دەرگـات داخـست بـە یـادی خـودا
رێـــی دوژمـــن نییـــە گـــوزەرکـــا پـــێیدا
ئـەو یـادە ئـەبـێ بـە بڵێـسەی نـار
بـــۆ ســـوتاندنی دوژمنـــی ئـــەشـــرار

هـەروا ئـەبـێتە چـرای بـەرقـی نـوور
بـۆت روونـاک ئـەکـا چ نزیـک چ دوور
کـە گـەر خـەیاڵـی بـێگانە بـێ بـۆی
ئـەی گـێڕێتەوە بـۆ خـەزانـەی خـۆی
ئـەگـەر دەرگاکـەت کـردەوە بـۆ غـەیـر
تـاڵانی ئـەکـەن لـە پیتـاکی خـەیـر
ئـەوەی بـە نرخـە ئـەیبـەن بـە جـارێ
ئـەتکـەن بـە لاتـی کـۆڵانی شـارێ
دڵ هـەر دڵـێکە سـەرە بـەد حاڵـە
پـاکی کـەرەوە لـەوەی بـەتاڵـە
(نـامی) بـە سـەهلـی نـابی بـە ئـادم
تـێکوشە بـۆ خـۆت بـەدڵ و بـە دەم

## هۆشیاربە کاتێ دەس بە نوێژ ئەکەی

هۆشـیاربە کـاتێ نوێـژەکـان ئـەکـەی
بەڵکو بە نـووری فـەیـزی حـەق بگـەی
کاتێ دەسنوێژت گـرت بـە ئـاوی پـاک
خـۆت پـاک کـەرەوە لـە لـێڵاوی خـاک
وەکوو دەست و پێ و رووخسار ئەشـۆری
دڵـیش بـشۆرە لـە رەش و بـۆری
کـاتێ راوەسـتای بـەرەو رووی کابـە
بـۆ خـاوەن خانـە بـە دڵ ئاگابـە
کـاتێ کـە وتـت (الله اکبـر)
(مُمکنـات) هـەمـوو دەربکـەرە دەر

یەک تەکبیرەکەت دانێ بە چوار
لەسەر جەنازەی فیکری رۆژگار
بەرە لاّ مەکە دەرگای دلّەکەت
با ئەغیار نەیین بۆ مەنزلّەکەت
وتت(وَجَّهْتُ وجهِی لِلّه)[1]
با واتەت راس بێ بە دلّی ئاگا
کاتێ دەستت کرد بە(بسم اللهِ)
ناو و خاوەن ناو لێیان ئاگابی
بۆ موناجاتی حوزووری خودا
خۆت فاریغ بکە لە هەوا و سەودا
هەر جوملەیێکت بە دەما هێنا
دلّی بۆ بکە بە سەفحەی (مینا)
سەنا سەنایە و دۆعا دۆعایە
(إستعاذه) پشت مەعنای جیایە
ئەوەی ئەی خوێنی و ئەو کارە ئەیکەی
ئاگات لە خۆت بوو بە زایەی نادەی
هەرکام کلیلە لە بۆ دەرگایێ
هەموو جەمیلن لەلای خودایێ
بێ گومان یەک رۆژ نوێژی وابکەی
بە خێری نوێژی دەرۆژان ئەگەی
خۆ ئەگەر سالّێ ئاگات لە خۆ بێ
تا دە سالّ ئەبێ ئەنوارت پێ بێ

[1] واتە: رووی دلّی خۆم کردووەتە خودا؛ ئایەی ٧٩ی (انعام)

کــاتێ ئــەم حالّـــە بـــوو بـــە (مَلَکـــە)[1]
بــاش رزگــار ئــەبــی لــەبــای(مَهلَکــە)[2]
(معـــراجُ المُـــؤمن) نویێژێـــکی وایـــە
لـــە موناجـــاتی خـــودا ئاگایـــە
(تحیـة)ی خــودا و ســەلام بــۆ رەســول
شــەهــادەت نامــەن بــۆ پایــەی(وصــول)
هــەرکــەســێ بــەدڵ بــبێ بــە ئینــسان
شــانی شــایاوە بــۆ نــەجمــەی ئیحــسان
ســا خــودا بــە حــەق نــووری دڵــەکــان
بــە ســەفــای سینە دەروون گوڵــەکــان
نووریێــکی وەهـــا بـــدە بـــە دڵـــمان
نـــوورانی بکـــا دڵ و مـــەنزڵـــمان
تــا بــبێ بــەنــار بــۆ دێــوی بــەد دڵ
تــا ببێ بــە نــوور بــۆ رێــگەی مــەنــزڵ
لــەگــەڵ نــار و نــوور بــڕۆین بــە رێــدا
ویقـــاری راســـتی بـــبێ لـــە جـــێدا
(نـــامی) نـــازانێ لوغـــەتـــی ئـــەحبـــاب
(تَـشَبُّث) ئــەکــا بــە گــەلــی ئــەسحاب
(خـــير امّـــة اخرجـــت للنّـــاس)
بەڵــکو لــە وەســواس دڵ بــبێ خــەلاس

---

[1] - خوو؛ عادەت
[2] - بای مەترسیدار و سەرتیا بەر

## ئیخلاس ئەساسە

ئیخلاس ئەساسە بۆ مایەی خەلاس
ئیخلاست نەبوو ئەگەی بە ئیفلاس
هەر کارێ بیکەی لە رێی خودا دا
چەن قات جەزایە بێ شوبهە لەودا
هەر قەول و فیعلێ دوور لە خودایە
سودێکی بێ هەر بۆ دنیایە
ئینسان خەزێنە و وەختی ئاڵتونە
ئاڵتون زایەدان کاری مەجنونە
ئادەمی راستی ئەوەیە ژینی
بکا بە فیدا بۆ دنیا و دینی

## وەتەن باخێکە و ئادەمی دارە

وەتەن باخێکە و ئادەمی دارە
دار بۆ دیمەن و بەر و میعمارە
سەرو بۆ دیمەن عەرعەر بۆ میعمار
سافە و درێژە بۆ سەقفی زەڕکار
باقی دارەکان کە سەمەردارن
بۆ ژینی ئینسان گەلێ بەکارن
داری بێ دیمەن بێ بەر و بێ کار
کۆسپە وا لەرێی ئینسانی رێبوار
نەبوونی چاترە گەلێ لەبوونی
بوونی مایەیە لەبۆ زەبوونی

پــاش کــەوتــی وەڵات لــە نــەزانانــە
لــە خــۆ پــەرەســت و عــەنــادەکانــە
لـەو کـەسـانەیـە لـە جـەهـلا ئـەژیـن
لە ئەسپان کورتان لە کەر ئـەکـەن زیـن
چـاری ئـەم غـەوغـا لـە رووی جیهانـا
مـــەجلیـــسی بـــەرزە لـــە زاناکانـــا
یاســـاین بگـــرن راســـت و رەســـابێ
بـۆ گـەورە و بچـوک فـەرمـان رەوابـێ
یـانێ مـەجلیـسێ لـە هۆشـمەنـدان
نەک خۆ پـەرەسـتی بـێ بیـر و ویجـدان
لـــەو رۆژۆ دنیـــا دروســـت کـــراوە
بە جـەهـل و عینـاد هـەرچـی قـەومـاوە
گەلی هۆشـمەنـد رێـی عینـاد ئـەگـرن
ئاسـاییش لـە بـۆ عالـەم وەرئـەگـرن
مـــێژووی رابـــوردوو دەرمانـــە بـــۆ دڵ
لەبـۆ پێـشکەوتـن بـۆ حـەلـی موشـکڵ
بـــەراوردەکـــان لـــە(سُـنّة الله)ن
لادەر لـە سـوننەت سـەفیـە و گومـڕان
ئاسـن بـە ئاسـن دەمـی کـول ئـەبـێ
ئینـسان بـە خـۆراک ملـی زل ئـەبـێ
پیـاوی پیـشەوەر بـەدەنـی سـاغە
باخـەوان بـە گـوڵ دەمـاغی چاغـە
مایـە بـۆ ژیـوار زانـست و کـارە
پیـشە و راوێـژی مـەردی هۆشـیارە

گـەلـێ دەلیلـی[١] ئـادەمـێ کوێـر بـێ
فەرزە گوڵۆڵـەی سـەر بـەرەو ژێـر بـێ
گیـانی کۆمـەڵـیش هـەریـەکیـەتـی یـە
گـەل بـێ یـەکیـەتـی روی لـە شـێتیە
یەکیەتـی لـەژێـر ئـالاّی حـەق پـەنـاه
(أی لا اِلـــــــهَ لَنــــــــا اِلا الله) [٢]
سـەربـەرزی ئـالاّیش بـە ئیعتیدالـە
(افـراط) و(تفـریط) مایـەی مـەلالـە
عالـەم بـە جـاریّ بـڕۆن بـۆ کـێوان
ناچـار ژن دێـنن لـەگـەلـی دێـوان
ئـەونـەی پـێ نـاچێ کـە ژنیـان ئـەزێ
دێـوێ دووڕەگـی نابـاری ئـەبـێ
هەمویش بە جاریّ بەرماڵ بـە کـۆڵ بـێ
ئـەبـێ بـۆ نـانێ سـەربـەرە و دۆڵ بـێ
(لـیس الرجــل رجــل الـــدنیا
ولا الرجــل رجــل الأخـــری
بــل الرجــل رجلاهمـــا)
بۆ دیـن و بـۆ ژیـن بـۆ عـەرز و سـەمـا
دەخیلـە بـێنۆ بـۆ لای (انـضباط)
دوور بن لە (تفریط) دوور بن لـە (افـراط)

---

[١] - رێ پیشاندەر – چاوساغ
[٢] - هیچ خوایەک لە بۆ ئێمە نییە کە شایستەی پرستن بێت جگە لە زاتی موبارەکی (الله)

بیر بکەنەوە بفامن بۆ خۆ
بێنەوە سەر خۆ بە رەنگ و بەبۆ
زانست و کار و سەنعەت بە سوودە
دارای ئەمانە ڕوی لە مەقسوودە
ڕێگا بەتەکان توولی تەی ئەبێ
ئینسان بە ڕاوێژ دوورە وەی ئەبێ
چۆن ئەبێ وڵات دائیم غەوغا بێ
هەرکەسێ بۆ خۆی میروئاغا بێ
گەورە و بچووکی (سنة الله) یە
پەنجەی دەست و پێت شادەی خودایە
گەوورە و بچووکیش لەسەر یاسایە
عیلم وعەمەل و(تضحیه)ی تیایە
ئەوەی حقووقی نەبێ لەژینا
نەدنیای ئەبێ نە وا لە دینا
گیان لە بەرێکە ماوەیێ ئەژی
ئەمرێ و با ئەیبا بە وێنەی ژیژی
دەستی بۆ ببەی بەڵکو بیشۆری
لەبەر دڕکەکەی قەت پێی ناوێری
دنیاکەت بینی یەقین بۆ دینی
حاڵی بەدترە لە بێ تەمکینی
بێن بۆ بەراورد ساڵێ لە ساڵان
مەجلیستان ببێ وەکو خۆشحاڵان
ئەوجار بە ڕاوێژ بێنە سەر عەمەڵ
تا حاڵی ببن لە حاڵی کۆمەڵ

بــەڵام مــەیێــڵن خاڵــی چــاوان شــین
خــۆی بخاتــە نــاو بــۆ دنیــا یــا دیــن
چونکــە حــەڵــوایان ســەراســەر ژارە
پێــستیان نــەرمــە و وەزەیــان مــارە
مــەڵــێن زۆر ئــەدوێ دەردی دڵ زۆرن
بازیکیــان هێــشتا هــەر ســەر بــە مــۆرن
پیــاوی(صــیدل)[١]ی لــە ئــور و پــاوە
بــێتەوە بــە ســەد ســەنــدوق دەواوە
درمانـــەکـــانی تکـــی نامـــێنی
هێشتا هــەر نــەخــۆش بــاش ئــەناڵــێنی
بۆ چی بــەم جــۆرە ســەرتــان لــێ شــێوا
دوێــنێ بــۆ زانــست قوڕتــان ئــەپــێوا
ئێــستە لاخۆتــان خــاوەن (ثقــاف)[٢]ەن
دەی بــۆچی وەهــا خــاوەن (ســخاف)ەن
ئــەمجــار ڕوو ئــەکــەم لــەفــەرامۆشــی
پاش دەرســی بــەرزی چاکــە خامۆشــی
(نامی)چــەن قــسەی ڕاســتی بــۆ کــردن
ئیتــر بــە خــێر بــێ جــەرەســی مــردن

## برام گوێ بگرە شکایەتمانە

بـــرام گـــوێ بگـــرە شـــکایەتمانـــە
لـــە دەردی دنیـــا حیکـــایـــەتمانـــە

---

[١] - پیاوی دەوا فرۆش
[٢] - ڕووناکبیر: خاوەن فەرهەنگ

دێـــتەوە بیـــرم کـــاتی منداڵـــی
دایکـی رەحمـەتـیم بـە پـڕ کـەماڵـی
بـۆی گـێڕاینەوە بـە تـوول و تـەفسیل
فروفێـــڵەکـــەی تیتـــل و بیبـــل
نـــازانم چلـــۆن خـــەبـــەریـــان پیـــدا
لـەمـاوەی ژینـا چـەن شـت روو ئـەدا
گورگی بزن و مـەڕ لـەگـەڵ بـێ دەنگـی
کردوویـــە بـــە داو گـــۆڕینی رەنگـــی
جـاریٚ دێ بۆمـان لـەلای خـۆرهـەڵات
بـە نـەغمـە و ئـاواز خـەڵات و بـەرات
جـــاریٚ تـــر دەردێ لـــەلای خۆرنـــشین
ئیتـە سـەرباسـی فـەرهـاد و شـیرین
جـاریٚ رەنگـی زەرد بـازی جـار مـۆرە
گـەلـێ جـار سـوورە و بـازێ جـار بـۆرە
لـە هـەر رەنگـێک دا بـۆی دێـنە گـۆڕێ
ئـــەڕوا و دێـــتەوە رەنگـــی ئـــەگـــۆڕێ
چـــونکی ئـــەزانـــێ ئـــێمە منداڵـــین
هەرچەن پیر بووین، دوور لـە کـەماڵـین
وایـــە(خریطـــە)[١]ی ئـــەم دەور و نـــاوە
بـــاوام خـــەزێـــنەی لـــە کـــوێ دانـــاوە
بـــەڵـــکو بیـــدزێ و بیبـــا لـــە بـــۆ خـــۆی
تـــا ئـــێمە ببـــین بـــە (خـــادم) لـــەبـــۆی

---

[١] - نەقشە

ئـەگـەر خـەزێـنەش نـەبـا بـە تـاڵان
هــەر دزی ئـەكـا لــە خـاوەن مـاڵان
ئـەگـەر مـاڵ نـەبـوو بیبـا و بـی دزێ
دەرمـان دائـەكـاو وڵات ئـەلـەرزێ
باش لەبیرم دێ پـاش جـەنگـی گـشتی
بـێجگە لـە جـەفـا و ئـازار و زشـتی
كـە گـەڕایـەوە دژمـن لـە وڵات
عالەم گـەڕۆڵ بـوون گـەرۆڵـی داهات
یـانێ هـیچ نـەبێ بـەبێ وەی نـاچێ
دارێـكی بینـی هـەڵـی ئـەپـاچێ
باخ بێ باخـەوان شـاخ بێ شـاخەوان
هـەر دڵ مایـەوە بـوو بـە داخـەوان
بەڵام لە رەحمەت هـەر مـەئیوس نـابم
مـادام دڵ گـەنجـە بێ عـەروس نـابم
پـاش قاتـە ساڵـی بـاران ئـەبـارێ
پڕ ئـەكـا لـە ئـاو چـەشـمە و جۆبـارێ
بەڵكو رەحمی حـەق كـە كـەوتـە بـاران
بێ نـسیب نـابێ سـەفحـەی كۆسـاران
وەكـو تۆفـانی قـاری كـاتێ هـات
بـاش داگیـری كـرد سـەراسـەر وڵات
هـەروا بـارانی رەحمـەتـی عامـە
چونكـە ئایینمـان دینـی ئیـسلامە
(نـامی) بـە هیـوای رەحمـەتـی (اكبـر)
ئەژیی و پـاش مـردن ئـەڕوا بـۆ مـەحـشەر

## حەواسی (خەمسە)

حـەواسـی خـەمـسە لـە ئـەوەڵ جـارا
خزمـەتـی باشـیان هـەیـە لـە کـارا
جـەماڵـی بینـی عاشـقی ئـەبـێ
بـە خزمـەت کـاری سـادقی ئـەبـێ
دەنگێ خۆشی بیست بە دڵ گوێ ئەگـرێ
لـە نـەواو هـەوای سـەفـا وەرئـەگـرێ
تامی حەڵوای کرد هەر بە لـێ چـەشـتن
حەوڵی بـۆ ئـەدا تـا بـە خوێـن رشـتن
بەرگی حەریـری نـەرمـی کـەوتـە دەس
ئەیبـا و ئـەیپۆشـی تـا ئـاخر نـەفـەس
بـۆنی گوڵـی کـرد وێـنەی وەنـەوشـە
ریشەکەی ئەبـا و ئـەیـنێ لـە حـەوشـە
بەڵام پـێش ئیحـساس ئـەگـەر دیعایـە
ئـەمانـەی ڕەش کـرد لا خـاوەن غایـە
نەڕەنگ و نـەدەنـگ نـە تـام و نـە بـێن
نرخی نامێنی و زەیـن ئـەبـێ بـە شـێن[1]
یانێ هـەرکـەسـێ لـە پـێش ئیحـساسا
شـتی لاپـیس بـوو لـە دەنـگ و باسـا
مـەگـەر دانایـی لـە چـەرخـی دنیـا
خـۆی بگـرێ لـە بـەر دیعایـەی وریـا

---

[1] – عەیب؛ لەکە

هــەزار دەلیلــی تــەبیعــەت بورهــان
بــی ســوودە لــەلای نــادانی(مُهــان)[1]
ئــەوەی کــە قیــزی شــیواوە لــە چێــشت
را ئــــەکــــا وەکــــو رەوان لــــە بنێـــشت
وەنــەوشــەی پــەلرِێــز بۆگــەنــە لــەلای
شەکری قــەنــدەهــار تاڵــە وەکــو چــای
حــەریــر هــەرچــەنــدێ نــەرم و نیانــە
لای ئــەو زریــــشکی دێــی دەرزیانـــە
(الحاصــل) فـــەرزە ئینـــسانی هۆشـــیار
پارێـــــزی بـــبێ لــــە رووی رۆزگـــــار
لـــە دیعایـــەی بـــەد وریـــابێ وریـــا
تــا دە نگـی شــەڕی نــەڕوا بــۆ دنیــا
نــەکــا بــەدکــاران لــەســەر گفــتوگــۆ
واتـــەی راســـتی ئـــەو دانـــێن بـــە درۆ
حـــەقیقـــەتـــێ بـــوو لــــە رۆزگـــارا
بـــاش بپارێـــزێ لــە نــاو ئــەســـرارا
هــەتــا حــەقیقــەت نــەبــێ بــە ناحــەق
تا مەحروم نەبن عالــەم لــە رێــی حــەق
دیعایە و عەقل و سەخـا و ئــەسـڵی تـۆ
پایەن بۆ بەقــای ئــەسـڵ و فــەزڵـی تــۆ
لــەســەر دیعایــە دڵ کــە نــەخۆشــکەوت
چاری محاڵــە مــەگــەر بــە هــەڵــکەوت

---

[1] ریسوا کراو؛ بێئابڕو

پارێز چاترە لە دەوا خواردن
چارەی موسیبەت لە پێشا کردن
تایبەتی ئەوەی گوێ ئەگرێ لە بەد
خەبەردار نەبێ مەعنای رەسم و حەد
ئینسانی لەلا ئەکەن بە نەسناس
فریشتەی قودسی بە ڕەسمی خەنناس
(نامی) ئەمانەی لەسەر بە راورد
وەرگرت و هێنای لە بۆ گەلی کورد
فیکری ماسۆنی کەهاتە رووی کار
غایە ئینکارە بۆ پەروەردگار
کە خودا نەبوو شەریعەت نییە
نە رێی رەسولە نەجێی نەبییە
ئەو جارە هەرکەس لەسەر بیری خۆی
رەسا دائەنێ بۆ ژیانی خۆی
هەر چۆن رێ کەوێ مانیعی نییە
کە ئایین نەما مانیع بۆ چیە
جار بە جار ئەڵێن ئیمە وجوودین
یانی خادیمی بەقای مەوجوودین
باش تێ ئەکۆشین لە رێگای ژینا
کە مردین ئەرۆێن بە ناو زەمینا
جار بە جار ئەڵێن هەر تەبیعەتە
کە خاوەن کارە و بارە و سەنعەتە
(الحاصل) بیری ماسۆنی تاریک
شەریکی شەڕە و لە واقیع تەریک

فــاریق نایێــڵێ لـــە رووی جیهانـــا
لـە بـەینـی ئینـسان لـەگـەل حـەیوانـا
بــۆ نــەفعــێکی خــۆی دنیــا بــسوتێ
کـــەم نابـــێتەوە بـــە وەزنـــی پـــوتێ
جـا بـۆ ئـەم بیـرە چـەن بـارێ هـەیـە
بـۆ هـەر تـاقمێ چـەن کـارێ هـەیـە
غایـــەت کـــەزانـــی(غایـــةالغایـــە)
بـــەرزی خۆیانـــە لـــەم روی دنیایـــە
هـــەرچـــەنـــدە زۆرە رێـــگەیـــان زۆرن
سەوز و زەرد و ســوور بـەڵــەک و بـۆرن
بۆ تـەنیـا کـارێ چـەن رێـگە ئـەگـرێ
بـەڵـکو بـە وانـە غایـە وەر بگـرێ
بـۆ زیـددی ئیـسلام دێ لـە خـوارەوە
ئـەدالـە یاسـای تـەعلـیم دارەوە
وا ســووکی ئـەکـا لـە بـەر چاوانـا
باســـی نامـــێنێ لـــە نـــاو ناوانـــا
ئـەوە سـەری گـرت ئـێتە سـەر ئیمـام
بـۆ چیتـە بـەسـە (نـصوص)ی کـەلام
ئـەوەی کـە باسـی نییـە لـە کیتـاب
والـە سـوننەتـا بـە شـێوەی (صـواب)
مەبـەس ئـەمـەیـە تـەحقیـق نـەمـێنێ
بو حـەللـی موشـکڵ تـەدقیـق نـەمـێنێ
ئینجـا موبتـەدی و ئینـسانی نـەزان
ئـەکـەونـە راوی هـەرچـەن کـە ئـازان

زوو بایی ئەبن بە عەقڵی خۆیان
فەتوا دەرئەکەن چۆن دەرچێ بۆیان
ڕێگەیێکی تر تەزویدی[1] عامە
بەوەی خیلافی حوکمی ئیسلامە
ئەنواعی هەڵە و پەڵە لە ئەفکار
ئەخەنە بەر چاو ئینسانی هەژار
هەتا بە جارێ دەرچێ لەهەموو
نامێنێ فەرقی لە کافر بە موو
ڕێگەیێکی تر نەقدی کوببارە
لەموهاجیرین یا لە ئەنسارە
بۆ ئیحیای فیتنەی هەزار ساڵی پێش
دەرونی داماو پڕ ئەکەن لە ڕێش
ڕێگەیێکی تر باسی ئەنبیا
قەساب ئێتە سەر بەرخی دڵنیا
ڕێگەیێکی تر باسی قورئانە
باسی قیرائەی قارییەکانە
ڕێگەیەکی تر باسی سوننەتە
هەرموتەواتیر مایەی حوججەتە
ڕێگەیێکی تر باسی فیرقەکان
لە موعتەزیلە و خەواریجەکان
(مُوجِب)ی خەلاس بۆ فەردی ئەمڕۆ
هەر عیلم و عەقڵە بۆ من و بۆ تۆ

---

[1] - ڕێگە دانان

ئـــەوەی عـــاقڵ بـــێ نـــەزانـــێ ئیجمـــاع
والـــە پـــێش فیکـــری فیرقـــەی ئیبتیـــداع
هـــەرچـــی ئیجمـــاعی لـــەســـەر کـــراوە
باســـی ئیعتیـــراز لـــەویـــا نـــەمـــاوە
کـــە ئیجمـــاع نـــەبـــو بـــە (اَکْثَرِیَّـــة)[1]
تـــۆ رزگـــار ئـــەبـــی لـــەبـــای (بلیّـــە)[2]
ئـــەنـــا هـــەر کـــەســـێ باوێـــشکێ بـــدا
چۆن ئەبێ ئینـسان گوێـچکەی پـێبـدا
نـــامی نـــەجـــاتی بـــە (اعتـــصام)ە
(عُـــروةُ الـــوُثقي)[3] وێـــنەی (حـــسام)[4]ە

## تەرهیب و تەرغیب و تەهزیب

کاری ئەوکـەسـەی رووی لـە تـەهزیبـە
لەسـەر تـەرغیبـە و لـەسـەر تـەڕهیبـە
یـانی بـۆ ترسـە یـا لـە بـۆ تـەمـا
کـاری ئـادەمـی لـەعـەرز و سـەمـا
ئـەوەی بـۆ بـەشـەر ئوسولّـی دانـا
بـە بیدائییـەت هـات بـەجیهانـا
یـانێ منداڵـی شـایاو بـۆ تـەدریـب
یا شەخسی گەورەی دڵ لەسەر تەهزیـب

---

[1] - واتە: راو بۆچونی زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئۆممەت
[2] - واتە: بای ناڕەحەتی و ناهەمواری
[3] - بەهێزترین هۆکاری رزگاری
[4] شمشێری بە بڕشت

ئـــە نـــابۆ گـــەلـــی زانـــای پـــڕ نیفـــاق
زەحمەتە تەئـسیر لـە یاسـا و ئـەخـلاق
مـــەگـــەر زۆرێـــکی وهـــا بـــێتە کـــار
غالـــب بـــێ لـــەســـەر یاســـای ڕۆزگـــار
دەوامـــیش بکـــا تـــاچین پـــێ ئـــەگـــا
لـە یاسـای راسـتی ڕەسـای تـێ ئـەگـا
مەسـەلـەن وێـنەی ئیـسلامی ئـەنـوەر
کـەهـات و دای‌گـرت ئافـاقی بـەشـەر
هەتا حالّی بوون کـە ئیـسلام حـەقـە
قورئـان دەسـتووری عـامی موتـلّەقـە
ئـەمجـار بـە جـۆرێ یاسـای بزانـە
(اسـتکراه) و (حُـبْ) بـۆ ئـەم ئینـسانە
تا حوببت نـەبـێ لـە بـۆ یاسـای خـۆت
چۆن دائەمەزرێ ڕێـگەی ڕاس لـە بـۆت
تـا نـەکـەرهـێنی دژمنـی یاسـا
چۆن تەمیـز ئـەخـەی ڕەسـا و نـاڕەسـا
ئەمجار عەلاوەی تـەرغیـب و تـەرهیـب
لـە بـوغزی دژمـن لـە حـوببی حـەبیـب
ئـەگـەر خـاوەن کـار بـە دڵ هۆشـیارە
خـێری وڵاتـی میلیـار میلیـارە
بـەشـی ئـەمـوو ئـەو ئـەدا لـە خـێرات
تـەقـدیری ئـەبـێ لـەسـەر دەرەجـات
غەوغـا نایێـلێ لـەسـەر سـوکە سـووچ
هەم هەمـە نـابێ لـەسـەر کـاری پـووچ

هەرکەسێ ڕێگەی کاری خـۆی ئـەگـرێ
بەشەر بە خۆشـی ئـەژێـیت و ئـەمـرێ
بــەراوردێــکە ئــەشـــێ بــۆ بورهـــان
(عِلْـــمُ اليَقِـــينِ حَـــقٌ لايُهـــانْ)
ئـەنـا هـەرکـەسـێ بـۆ خـۆی ئاغـابێ
ئــەبـــێ بـــە دەوام دنیـــا غـــەو غـــابێ
فەرزە لەسەرمان وەکوو فـەرزی عـەیـن
نەسیحەت بکەین بـۆ تـەنـویری زەیـن
ئیتــر هــەرکــەســێ گوێــمان پــێنــەدا
زیـــان لـــە دیـــن و ژینـــی خـــۆی ئـــەدا
قەت دنیا ناژی بـێ تـەمـێ و تـەدریـب
بـەبـێ دەوامـی تـەرغیـب و تـەرهیـب
بـێ ئیـستیکراه و مـەحـەبـەی ئینـسان
ئەمیان بۆ فەساد ئـەویـان بـۆ ئیحـسان
(نامی) فەرزە بۆی تەحریـر بـە قـەڵـەم
(کَـــیْ يُعَلِّـــمَ الَّـــذِي لَـــمْ يَعْلَـــم)[1]

## یاران بەسەرتان

یـــاران بـــەدەوام چـــاوەچاوەمـــە
لـــە بـــۆ دیـــدارتان جـــۆش و تاوەمـــە
لـــە ســارا و دەشـــتی مـــەحزونـــی خۆمــا
وەک ڕۆڵـــەی گـــوم بـــو بـــاوە بـــاوەمـــە

---

[1] – تا فێر بکات ئەوەی کە نازانێت

بـــە دوای خـــێڵا وەکـــوو دوور لـــە خـــێڵ
لـــەســـــەر بـــەرزانـــا قـــاوەقـــاومـــە
بـــۆ نـــووری ســـینەی دڵ پـــڕ ســـەفاکـــان
لـــە ســـینای شـــەوقـــا کـــاوە کـــاومـــە
بـــە یـــادی ئـــێوە دڵ کـــە ئـــێتە کـــوڵ
وێـــنەی مـــەنجـــەڵـــی کـــەف رێـــژاومە
شـــێتی و شـــێواوی و شـــەیـــدایی دڵـــم
بـــۆ گـــەلـــی دۆســـتی پیـــر و لاومـــە
یادتـــان ئـــاگرە و دووری زەمهـــەریـــر
بـــوین نـــەخۆشـــی لـــەرز و تاومـــە
کـــوا بابـــای گـــەورەم کـــوا(عبـــدُالکریم)
چۆنیـــان ببیـــنم بـــەم دوو چاومـــە
برا و دۆست و کەس مام و خـاڵ نـەمـان
ناچـــاری یـــاری نـــاو بـــە ناومـــە
بـــۆ گـــەلـــی پـــاکی ســـەفـــا پـــەروەرم
بـــرا بـــە ســـەرتـــان گلاراومـــە
ئەگـەر دەس کـەوێ دوستـێکی قـەدیـم
یاســـای پـــێچ و لـــول گیـــا لاولاومـــە
لـــەیلایـــێ واهـــات دڵ لـــە گریانـــا
خـــەریکـــی چـــاری چاولـــێڵاومە
رشـــتەی دڵـــداران ئاڵـــۆزاوە لـــێم
دڵ بـــەســـتەی رشـــتەی ئاڵـــۆزاومە
لـە سـارای هیجـرا سـەراسـیمە بـووم
مانـــدووی دەروونـــی لـــێ قـــەوماومـــە

دڵـم لـە لاپـێی هیجرانـا هـەڵـکەوت
مـەراقـی دڵـەکـەی هـەڵدێـراومە
ئاکـامم هـات و تـازە بـە هیـوای
تـەعمیـری خـانووی هـەڵـوەشـاومە
جا من چۆن نەگرییم بە هەر دوو دیـدەم
دیـدەی دوور لـە یـار کـەس نـەماومـە
(بیـارە) چۆڵـە و عـەبـابـەیلـێ هـەم
خاڵـی لـەفـەقـێی خـاوەن‌ناومـە
(هەڵەبجە) و (پریس)بێ دەنگی تەدریس
داخـی مـەدرەسـەی لاڕوخاومـە
( نەرگسەجاری) جـێی تاعـەت و دیـن
ئێـستە نـە مزگـەوت نـە میحراومـە
دڵ پڕ لە داخـی (مـەحمـودیسـەییـاح)
لـەسـەر بـوردییـەی خـاوەن باومـە
نـەوای داوودی ئـەدا لـە گوێـمان
دەنگـی وا لـە گوێـی گـوێ پـێداومە
(شیخ عبدالکریم) ئـەحمـد (بـەرنـەئـی)
مامۆسـتای فـەقـێی دڵ سـووتاومە
بـۆ عـیلم و دیـن و خزمـەتـی ئیـسلام
خـادیمی خاسـی دڵ برژاومـە
عـەللامـەی بـەرزی بـانی خـێڵانم
(عبـدالقادر)ی ساحـێب ناومـە

(اشراق) و (عَـشِی)[١] کـاتی ویـردی بـوو
ئـەیـوت ئـەمـەلـی نـاو هـەناومـە
کەئەمری ئەکـرد مـەئمـوور پـێی‌ئـەوت
ئـەمـرت (مُطاعَـە) و لـەسـەر چاومـە
قەرەداغ داخـدار بـۆ مـەدرەسـەی دیـن
لـەو رشـتە کـێوا پـەڕە و ناومـە
رشـتەی زانیـاری زەنجیـرەی شـەرەف
سـەد دورڕی لولـوی لـەبـەر چاومـە
مەخسوس مامۆسای عەللامـەی دەهـرم
(صـدّیق) کـردەوەی(فـارُوق) ناومـە
(عُمَـرْ) ئـەمینـی عـیلم و حـیلم و دیـن
مـەعروفـی چـەرخـی سـەر حـەسـاومە
تـالاوی پـێم چـەشـت دووری ئـەمانـە
دەم تاڵـی جـامی پـڕ تالاومـە
بـە تاڵـی و خۆشـی یادیـان ئـەکـەم
یـاد و باسـیان نـان و ئاومـە
مـن هـەتـا رۆژی لیقـای دڵـداران
هـەر دڵ بـەیـاد و دەم سـلاومە
کـاتێ کـەنـاوی بابـا رەسـوڵ بـێ
وێـنەی منـداڵان ئـاو بـە چاومـە
یا خۆ کە باسی شـیخ (عبـدالکریم) بـێ
خـاوەنـی کـورەی دڵ بـە تاومـە

---

[١] -(اشراق) بەرە بەیان-(عَشِی) ئێوارە

کـاتێ کـە یـادی مـەجلیـسیان ئـەکـەم
ئیتـــر بـــە راســـی گلاراومـــە
باسی سوحبەت و مەحـەببـەت ئـەکـەم
ئێـشی هیجرانـــی گـــەنـــج و لاومـــە
یـادی کـەرەم و سـەخایـان ئـەکـەم
حاتـەمـی مـەشـهور لـەبـەر چاومـە
واتەیان عیلم و عـەقـڵ و حیکمـەت بـوو
ئیتـــر چـــۆن مـــەیلـــی چـاوەڕاومـــە
دڵیان لـە نـووری مـەعریفـەت پـڕ بـوو
ئـەتـوت سـەرچـاوەی پـڕ لـە ئاومـە
مـەنزڵـیان ئـەتـوت بـاغی گوڵـباغە
یـا وێـنەی شوشـەی پـڕ گوڵاومـە
(نامی) تا نامـەی ئـەجـەل وەر ئـەگـرێ
لـە بـۆ دیـداریان جـۆش و تاومـە

## دنیا دارێکی بەرز و بەرداره

دنیـا دارێـکی بـەرز و بـەرداره
مـێوەی شـیرینی هـەزار هـەزاره
پێویـستە بـۆ تـۆ بڕۆیتـە سـایەی
وەربگـری بـەری بـە پایـە و مایـەی
بـەڵام مـەڕۆرە سـەر لقـی وردی
ئەشـکێ ئـەکـەوی و لـەسـەرنامـەردی
یـانێ رو نـەکـەی لـە کـاری نابـار
با تـێکەڵ نـەبـی بـە عـار و بـە نـار

( ان الإنـــسان ليطغـــى)[1] حــــەقـــــە
ئەگـەر(عـام) نـەبـێ یـەقـین (مطلقـە)ە
پێویـــستە پارێـــز لــە تــاوی توغیـــان
بــە پایـە و مایـەی ئـەمیـان و ئـەویـان
بـــەزۆری توغیـــان لـــە بـــائی بوونـــە
هـــۆی بـــائی بـــونیش هـــێزە یابوونـــە
نــە هــێز پایــەدار نــەبــوون بــە دەوام
ئەنجـامی هـەمـوو بـۆ سالّــە و نـەییـام
چەرخ هەڵ ئەسوڕێ و ئەڕێــسی هــەودا
یـەک یـەک هـەوداکـان فـڕەیـان ئـەدا
زوو ســـەرەیـــان دێ و خـــاو ئـــەبنـــەوە
بـــەســـەرە رێـــدا بـــڵاو ئـــەبنـــەوە
(نــامی) ســـکالای هـــەیـــە لای خـــودا
کــە بــائی نــەبــێ بــە ســەر و ســەودا

## نەکاتێک بچن

نــەکـا تــێک بچــن بــە نــەمــانی کــەس
زالّم یا مەزلّوم کـەس بـێ یـا نـا کـەس
دارای رشـــــتەدار لـــــە کائیناتـــــا
هـــێنای لـــەدانـــەی جـــەواهیراتـــا
چـــەن رشـــتەی جـــوانی هۆنیـــوەتـــەوە
بـــەخـــشی و کوتوپـــڕ ســـەندوویـــەتـــەوە

---

[1] - بەراستی مروڤ سەر کەشی ئەکەن –ئایەتی ٦ی سورەتی ( علق)

خۆی خاوەن ماڵە و خۆی خاوەن رشتە
خاوەن دۆزەخ و خاوەن بەهەشتە
هەرجەوهەرێکی دانا لە شوێنێ
ئەبێ لەو شوێنا باڵا بنوێنێ
تکە ئاوێکە هەتاو لێی ئەدا
شەوق و پڕ تەوی وەختێ پێ ئەدا
ئەونەی پێ ناچێ کە ئاو نامێنێ
یا خالیق شەوقی هەتاو ئەسێنێ
ماڵی ئەمانەت جێی بەقا نییە
لیقای زەرووەرت بۆ لیقا نییە
ئەوەی باوەڕی هەیە بە جەزا
ئەبێ بۆ جەزا وەربگرێ سزا
ئەوەیش باوەڕی نییە بە دیوان
با بژی و بمرێ بە وێنەی حەیوان
لەبۆ سیلسیلەی زەنجیری قەزا
دەوا هەر سەبرە و رەزا بە سزا
(نامی) لە خودا ئەپارێتەوە
بە قەزای نابار نەتلێتەوە

## پارێز لات نادا

پارێز لات نادا لە قەزاو قەدەر
بەڵام هەر فەرزە پارێز بۆ بەشەر
مەلە نەزانێ زانابێ و وریا
چۆن بە بێ کەشتی ئەڕواتە دەریا

هەرچەن قابیلە پاپۆڕی تەیار
بشکێ و بخنکێ و بڕوا نگون سار
هات و چو فەرزە لە رووی ئەم عەرزە
بۆ ئەوەی مایل بە مایەی بەرزە
بەڵام هەرکارێ بارێکی هەیە
هەر ڕێبوارێک یارێکی هەیە
لە یاسا لادان لادانە لە ڕێ
لادەر لە ڕێگە ئەڕوا بەبێ جێ
ئەنجامی عەمەل یا خێر و گەنجە
یاهەر ئازار و میحنەت و ڕەنجە
بەڵام قەت نابێ ئینسان بەدەوام
هەر لە ڕەنجابێ و نەگا بە مەرام
لەسەر قەراری قەزای ئیلاهی
دێتە جێ پایەی دارائی و شاهی
مەینەت وەکو شەو ئەڕوا و دێتەوە
زەنجیرەی دووره نابڕێتەوە
ئەحواڵ ئەگۆڕێ و دیسان دێتەوە
تا دەرگای ئەولا ئەکرێتەوە
با پیشەی ئینسان دائیم دوعا بێ
لە ڕۆزگارا دوور لە بەڵابێ
بەڵا دەردێکە بێتە سەر ئایین
یا نائەمینی لە بۆ ماوەی ژین
ئەمجارە دەردی جێگر لە لەشا
ئەمجار بێ رزقی لە کەشا کەشا

لــە مانــە بــەدتــر ســەرلــێ شــێوانە
زانـــا ئـــەکاتـــە شـــێتی دێـــوانە
کــاتێ نوێــژ ئـەکـا ئـەڕوا بــۆ بــازار
کــاتی مامــەڵــە ئــەڕوا بــۆ کۆســـار
ئەو رێــگە راستە نـای گـرێ بـۆ خـۆی
بــەڵــکو قــازانجێ رێ کـەوێ لـە بـۆی
بـــــەدڵ بـــێزارە لـــە ئامۆژگـــاری
بـێزارە لـە خوێـش لـە دۆسـت و یـاری
چـــارەی ئـــەم دەردە لـــەلای خودایــە
هــەر خــۆی خــاوەنــی دەردو و دەوایــە
(نـــامی) لـــە خـــودا ئـــەپارێـــتەوە
بـــەســـەر لـــێ شـــێوان نـــەتلـــێتەوە
چـون ســەرلـێ شـێوان دڵ لـێ شـێوانە
دڵ شـــێوا ئینـــسان وەکـــو دێـــوانە
دێو قەت رام نابێ مـەر بـۆ سـولەیمـان
موڵکی موختـەس بـوو نـادری پـەیمـان
چـارەیـان نییـە مـەگـەر چاڵــی ڕەش
جێی ئارامبوونی بە شدار نەک بـێ بـەش
(نـــامی ) دووبـــارە ئـــەپارێـــتەوە
بـــەســـەرلـــێ شـــێوان نـــەتلـــێتەوە

## رۆژێ لە رۆژان

رۆژێ لـــەرۆژان لـــە خـــەڵـــوەت خانـــە
ساکن بـووم بـۆ خـۆم بـەبـێ ئـەفـسانە

ناکــــاو ئینـــسانێ لـــەدەر هاتـــە مـــاڵ
پاش سەلام کـردن بـە شێوەی کـەمـاڵ
وتی ئەی پیـری تـەمـەن هـەشـتا ساڵ
ئـەی جیهـان دیـدەی ئـەوزاع و ئـەحواڵ
لـەم مـاوەی ژینـا هـاتوە بـەسـەرتـا
بـەسـەر(ادراک) و (سـمع) و (بَـصَرْ) تـا
کێت دی چیت پۆشی کام خۆشیت نۆشـی
چلۆنـت تـەی کـرد سـاغی و نـەخۆشـی
چۆن بوو ئـەنجـامی عـەیـش و نیـشاتت
چی بوو دەس‌کەوتی ڕووی سـەربیـساتت
زۆرم مـــەقـــسودە تـــەنـــویرم بکـــەی
بـــە میهـــرەبـــان؛ تـــەکـــدیرم نـــەکـــەی
کـــە پرســـیاری گـــەییـــشتە لای دڵ
دڵ بۆ یادی چـەرخ هاتـە جـۆش و کـوڵ
بیـــری کـــردەوە بـــە هـــێزی تیـــژی
لـــە مـــاوەی ژینـــی دوور و درێـــژی
وتـــی ئـــەی رۆڵـــەی پڕکـــەڕامـــاتم
پرســـیار کـــردووی مـــاوەی حـــەیـــاتم
تـــەبیعـــی جیهـــان بـــاخی ژیانـــە
گوڵـــە بولبوڵـــە نـــە واو فوغانـــە
دارە درختـــــە بـــــەرە ســـــێبەرە
دڕکـــە پـــەرژینـــی بـــەرزە کـــە مـــەرە
ئـێمەیـش بـە وێـنەی یـارانی جیهـان
ئـەحواڵـێکمان بـوو دیـاری و پـەنهـان

دێـــتەوە بیـــرم زەمانـــەی شـــیرم
بـاوەشـی دایکـی شـیرین تـەدبیـرم
دەر و مـاڵ لـەگـەل خوشـک و بـرادا
هـات چـو بـەلای کـووره و چـرادا
چەن رۆژم رابـورد بـە کـەیـف و شـادی
یـانێ بـێ خـەمـی و دەرون ئـازادی
کـاتێ ئـەچومـە ژێـر لیفـەی نووسـتن
کـاتی چـاو لـەرووی روونـاکی بـەسـتن
دەسـتم ئـەکـردە ملـی دایـەی خـۆم
وێنەی شازادەی بـەخـت و تـەختـی رۆم
بـۆ خـۆم ئـەنووسـتم تابـەرە بـەیـان
بـێ خـەم و خـەیـاڵ بـێ بیـری ژیـان
کە هەتاو نەکەوت هەڵ ئـەسـاین لـەجێ
دەست و دەم و چاو ئەم شۆرد دەس بەجێ
کـە ئـەهاتمـەوە لای بـاوە و دایـە
خـواردن حـازر بـوو بـە پایـەی مایـە
لـە پـاش ئـەمانـە ئـەچوینـە حـەوشـە
بـۆ یـاری کـردن ئـەوەی بـێ خـەوشـە
بـەم پـێ رامبـوارد تـا کـاتی تـەمیـز
ئـەم جـار بـە ئـەمـری والیـدی عـەزیـز
چوینـە دەرەوە بـەبـێ بـەهانـە
بـۆ خوێـندنی دیـن لـە قوتابخانـە
زوو بـە زوو خوینـدم (عـم)ە و (تبـارک)
بـاقی قورئـانی بـەرزی موبـارەک

کتـــێبە وردەی ڕەوشـــت و ئـــەخـــلاق
خوێـــندم بـــە یاســـای تـــەربییـــەی ئافـــاق
چـــەنـــدێ لـــە ریـــزی قوتابخانـــەکـــان
دەرزمـــان وەرگـــرت بـــە قـــەدەر ئیمکـــان
لەگەل مەشقی خەت لەسەر نوختە و خـاڵ
تا بووینـە خـەتتـات بـەئـەنـدازەی حـاڵ
ئـــەمجـــار چوینـــە دەرلا مامۆســـاکان
بـۆ سـەرف و نـەحـو و بـاقی عیلمـەکـان
تـا بـە یـارمـەتـی خـودای (ذُوالإِکـرام)
(تَخرَّجمـان) کـرد بـە یاسـای ئـەییـام
جـا گـەڕاینـەوە بـۆ تـەدریـسی دیـن
لـە بـۆ تـەسـقیفی[1] زومـرەی تـالیبین
بـەڵام لـە مـاوەی ئـەییـامی تـەحـسیل
گـەلـێ شـتمان دی ئـەیـەوی تـەفـسیل
چەن رووت و قـوتی و نـەبـوونی پۆشـاک
چـەن مونافـەسـەی ئینـسانی ناپـاک
چـەن هـەوڵ و تـەکـان بـۆ پایـە و مایـە
هـەتـا کۆشـشمان نـەڕوا بـە زایـە
چـەن دەرد و سـزای چـەرخـی جیهـانی
چـەن دۆعـا و نـزای بـەرە بـەیـانی
تـا بـە یـاری حـەق وەزعمـان گـۆڕا
چەرخیش بە هـەوای دڵـمان هـەڵ سـوڕا

---

[1] - ڕۆشن بیری؛ پێگەیاندن

چەن حەمد و سەنا چەن زیکر و تەقـدیس
چەن تەمێ و تەسکین چەن‌ئیلقاو تەدریس
چەن دڵ پەیوەندی بـە ئـەسـحابی دیـن
لە ئەهلـی فـەیـز و تـەنـویر و تـەمکـین
چەن مەجلیس رووناک بە عولەمـای بـەرز
وەکـو گـڵۆپی سـەدنمـرەی سـەرعـەرز
چەن سوحبەت لەگـەل ئـەربـابی سـەفـا
مـەحـەببـەت کـاری ئـەربـابی وەفـا
چـەنـدێ دڵ خۆشـی و ئومـێدەواری
بـە ئـەنـواری حـەق بـۆ فـەیـزی جـاری
چەن حەلل و تەحقیـق لـە بـۆ مـەشـاکیل
چەن جیلوەی تـەدقیـق لـەسـەر دەلائیـل
چەن نوکتەی نایاب چەن قسەی نـەسـەق
چەن شیعر و حیکمەت بە ئەدەب مولحـەق
چـەن بـرادەران پـاکی خاترجـەم
چەن ئەهلی وەفـا و سـەفـا بـەبێ خـەم
چەن خۆراکی پاک پـڕ لـە گۆشـت و ڕۆن
چەن مێوەی ناسک خاوەن عـەتـر و بـۆن
چـەن پیاڵـەی پـاک چـایی سـەیلانـی
چـەن قـاوەسـینی و قـۆری گـەیلانـی
چەن دەنگ و نـەوای مـەدیحـە و سـەنـا
چەندێ قەسـیدەی مـەردی حـەق پـەنـا
چەن سـەفـا و سـەیـران لـەگـەل یارانـا
چـەن دەور و گـەڕان بـە کۆسـارانا

چەنێ هەڵپەرکێی فەقێ لە سەیران
دڵی دانایان پێ ئەبوو حەیران
چەن سفرە و خوانم دانرا لەبەر
چەن بەرگی جوانم چەن لفەی مێزەر
چەن رابواردن بە قەدر و ئیعزاز
عومر تەی کردن بەناز و نیاز
چەن کاتی هاتی تاعەت و ئیحسان
چەندە یارمەتی و خزمەتی ئینسان
ئەمانمە هەموو بینی بە دوو چاو
بێ غەم و مەینەت بەبێ لەرز و یاو
چەندێکی پێ چوو چەرخی زەمانە
هەڵ سوڕا لەسەر بارەی بەهانە
وا پەرتی کردین رەشە بای زەمان
دوور کەوتینەوە لە بۆی نیشتمان
نەعەیش نەنیشات نە دۆست و یاران
نەخزم و نە خوێش بە وێنەی جاران
ئازار و بێزار مەینەت و کوربەت
نەخسوس میحنەتی غەریبی و غوربەت
بە عەکسی سابیق خۆی دایە دیار
یانێ(سُبحانَ الملِک القَهّار)
ئەونەی پێ نەچو بە فەیزی کەرەم
بارانی رەحمەت دای کرد بەخوڕەم
چاتر لە جاران رەحمەت داباری
وەکو بارانی کاتی بەهاری

ئــەوەی نــەمدیبــو حــەتتــا لــە خــەوا
خــودا بــۆی نــاردم لــەرۆژ و شـــەوا
شــەوم وەکــو رۆژ بــەســەفــا و روونــاک
رۆژم بـــە وێـــنەی دەروونـــی دڵـــپاک
فَالحَمْـــدُ لله علـــی مـــا أنعَـــم
والـــشُّکرُ لـــە علـــی مـــا أکْـــرَم
خودا هەر بە خۆت من قـەسـەم ئـە خـۆم
ئـەوەڵ و ئـاخر مـن بـەنـدەکـەی تـۆم
شـــوکر گـــوزاری پـــەروەردگـــارم
مــن هــەر بــەنــدەکــەی پــار و پــێرارم
(نامی) ئـەمـە بـوو شـەرحـی ئـەحواڵـی
لـــە وردییـــەوە تـــا گـــەورە ساڵـــی
(نـــامی) نیعمـــەت و نـــەوالـــی تاممـــە
تـــەنیـــا چـــاوەرێـــی حوســـنی خیتامـــە

## دنیا تاریکە بێ چوار ئەرکان

دنیـــا تاریکـــە بـــێ چـــوار ئـــەرکـــان
یــەکــەم لــەوانــە عــەداڵــەی سوڵــتان
مورشـــیدی کـــامڵ عـــالمی عامیـــل
چوارەمـین تـەمـێ و تـەربییـەی نـەزان
چ نـــەزانـــی پیـــر چ کـــەهلـــی رەســـا
چ گـەنجـی چـالاک بـە هـێز و پـەسـا
چ تیپـی منـداڵ هـەر لـە حـەو ساڵـی
هــەتــا بــێتە دی پایـــەی کـــەماڵـــی

لە پاش ئەمانە گەلێ رەسمی حەق
هەیە بۆ دنیا واجبن ئەلحەق
لە عیلم و سەنعە لە پیشەکاری
لە باغ و بێستان لە حەیوان داری
نەخسوس عیلمی(طِب) بۆ ساغی بەشەر
هەتا رزگار بن بەشەر لە خەتەر
ئەمجارە هێزی بەرگری دژمن
هەتا ئادەمی بژین بەهێمن
وێنەی تەبیبە مورشیدی دەروون
ئینسان دەرئەکا لە شەڕی مەلعوون
دڵی بریندار خۆش ئەکاتەوە
تا بەلای دینا لائەکاتەوە
ئەمجار مورشیدی ئەحکامی ئیسلام
لە بۆ تەعلیم و تەفهیمی ئەحکام
مورشیدێکی وا چاوی عالەمە
مایەی رزگاری دەرد و ئەلەمە
ئەمجارە مورشید بۆ ئامۆژگاری
بۆ چاری فیتنەی دێهاتی و شاری
پیاوێکی وەها زۆر بەبەهایە
قەدر و قیمەتی بێ ئینتیهایە
بناغەی هەمووی مەدرەسەی دینە
مەدرەسە مایەی پیرۆزی ژینە
ئینسانی بێدین دوور لە تەمکینە
دنیایشی بێ ژانە و برینە

سەد هەزار ئەسەف ئەهلی ئەم دنیا
نە ئەهلی دینن بەحەق نە دنیا
لە دین مەحرومن مەر لە دەدا دوو
دنیایشیان لەسەر هەوایە هەموو
لە چوار فەسڵەدا هەر بێ تفاقن
بۆ ناحەق نەبێ بێ ئیتتیفاقن
بەدەم داواچی ئە خلاقی بەرزن
بە دڵ غەوغاچی ئەهلی سەر عەرزن
مەدح و سەنایان ئەغڵەب درۆیە
درۆکەیش بۆخۆی نەک لە بۆ تۆیە
بۆ خۆیشی نییە چون خۆی ناناسێ
هەر بۆ خواردنە هەتا ئەماسێ
ئەگەر بە دەگمەن روو لە خوا کەن
ئەو نە فەرمانی ناڕەوا ناکەن
یانێ خەرمانی سەراسەر کایە
ئەم دنیا هەرواهەتا هەتایە
تاعەت رواڵە و دەمە و داوایە
دوورە لە تەقوا کەبۆ خودایە
ئیستەیش نازانم بۆچ کەسێ نییە
بیر بکاتەوە لەم کا بە بایە
بەخۆ نازانن هەتاکو ئەمرن
هەرساتێ یارێ بۆ خۆ وەرئەگرن
وەکو بریشکەی ناو سکی ساجن
قرچە و سوتانە و دوور لە عیلاجن

هەر نەژیت باشە ئەی برای ئینسان
نرخت کەمتر بێ لەدرۆی نەیسان
نە دین نە دنیا نە یاسا و نیزام
نە عیلم و سەنعەت نە یاسای (اکرام)
بوێ من ئەڵێم بێجگە لەئایات
بێجگە سوننەتی خاوەن (مُعجِزات)
غەیری حیکمەتی حوکمای عالەم
غەیری حەقایق بەشی موسەللەم
مابـاقی هەموو هەر خەڕافاتە
یا بوخت و درۆی پڕ (سَیّآت)ە
یا بۆ ریایە و مەسڵەحەت کاری
بە(ابن الوقت)ی حیلە و عەیاری
ئەگەر وا نییە پێم بڵێن بۆ وا
عالەم موشتاقە بۆ شنۆی هەوا
بۆچی وا درۆ بۆ ئەهلی دنیا
ئەبێ بە ئایین حەتتا بۆ وریا
ئادەمی چین چین ئەیکەن بە دەستوور
لێی گرد ئەبنەوە وەکو چرای نوور
من قسەم نییە لەم رەشە خەڵکە
ئەوانە دڵیان مینای بێ چڵکە
قسەم لە ئەهلی عیلم و ئیدراکە
ئەوەی بەدەعوا لەسەر ئەفلاکە
بۆچی بە وردی بیر ناکەنەوە
ئەنجامی ئەعمال لێک نادەنەوە

نـــازانن ئـــەوان بـــۆ عـــام پێـــشەوان
ئـــێتە ســـەر ئـــەمـــان تـــاوانی ئـــەوان
بـــۆ یـــێ (مُخاطَـب) بـه (طاهـا) و(یاسـین)
فـــەرمـــوُی(عَلَـــیکُمْ إثْـــمُ الأریـــسین)[1]
بـــویێ بـــەرەو روی ناشـــری بـــێ داد
وتـــارێ حـــەق بـــێ ئـــەکـــرێ بــە جیهـــاد
بۆیـــە واجیبـــە لـــەزیممـــەی بـــەشـــەر
ئەمـــر بـــەمـــەعـــروف نـــەهی لـــەمونکـــەر
جـــا ئـــەو دەردانـــە کـــە باســـمان کـــردن
چاریـــان لا کـــەســـی لـــە فکـــرا وردن
گـــەرانـــەوەیـــە بـــۆ یاســـای کیتـــاب
والله الهـــادی لِـــنَهْجِ الـــصَّواب[2]
(نامی) ئەگـەرچـی بـۆ خـۆی نـەخۆشـە
بـــۆ دەوای عالـــەم خـــاوەن پـــەرۆشـــە
لـــەخـــودای ئـــەوێ شیفایـــی کـــافی
(فَحَـــسبُنا الله و نِعْـــم الکـــافی)

## داخم سەقافە

داخـــم ســـەقافـــە ئـــاخم ســـەقافـــە
بـــۆچی تـــۆ گـــۆڕای بـــووی بـــە ســـەخافـــە

---

[1] – لە ئەستۆی ئێوەدایە گوناهی جوتیاران حەزرەت ﷺ لە نامـەکانیـدا کـە بـۆ پاشـاکانی ئـەنـارد داوای موسوڵمان بونی لێ ئە کردن وە ئەیفەرموو : ئەگەر ئێوە ئەم دەعوەتە قوبوڵ نەکەن تاوانی جوتیاران و ئەو خەڵکە رەش و روتەیش لە ئەستۆی ئێوەدایە

[2] – خودا رێ نمایی کەرە بۆرێگەی راست

دنیــا دامــەزرا لــە ســەر پایــەی عــیلم
لـەسـەر هۆشـیاری یـانی عـیلم و حـیلم
عــیلم ئــەساســە بــۆ رەفتــاری چــاک
رەفتــار بــۆ (وُصـول)بـە(مَحْـصول)ی پـاک
چەن خۆشە ئینسان دەرچێ لـە دونـی[1]
لە جەهـل و فـەقـر و عیجـز و نـەبـونی
بــبێ بــە مــەردی مــەیـدانی هــەیهــات
بـــبێ بـــە بـــەردی قـــەلا بـــۆ وڵات
بــبێ بــە خــاوەن عــیلم و حــاڵ و مــاڵ
سەرکەوێ بـۆ سـەر شـاپایەی کـەمـاڵ
بـــبێ بـــە قـــەلا بـــۆ رۆژی نـــەبـــەرد
بـــەرگـــری بکـــا لـــە عـــەدوی نامـــەرد
بـــبێ بـــە پـــەنـــا بـــۆ ڕۆژی تۆفـــان
بـبێ بـە مـەخـزەن بـۆ عـیلم و عیرفـان
بـــبێ بـــە مورشـــید بـــۆ تـــەنـــویری دڵ
بـبێ بـە ئوسـتاد بـۆ حـەللـی موشـکڵ
بـــبێ بـــە بابـــا بـــۆ منداڵـــی ورد
بـۆ تیمـاری زام زوو بـە دەسـت و بـرد
هـــەتـــا ئـــەو ڕۆژە مـــاوە لـــە دنیـــا
بـــبێ بـــە حـــاریس حاریـــسی وریـــا
ئـەمـەیـە مـەعنـای(ثقافـە)ی راسـی
ئـەگـەر ئـەتـەوێ کـە حـەق بناسـی

[1] – پەستی، بێڕێزی

(ثقافـــە)مـــەعنـــای هـــێز و زەفـــەرە
(ثقافـــە) عیلمـــی خـــاوەن ســـەمـــەرە
عـــیلمێ کـــە وەعـــی لـــە گـــەلیـا نـــەبێ
ئەو عیلمـە جـەهلـە چـاک وایـە نـەبێ
وەعـــی بـــە مانـــا ئاگـــاداریـیـــە
بـــۆ دیـــن بـــۆ دنیـــا نیگـــاداریـیـــە
زانـــستی بـــێ بـــەر بـــاغی بـــێ بـــەرە
باخـــەوان چـاوی هـــەر لـــە ســـەمـــەرە
ئـــەو(ثقافـــە)یـــە مایـــەی ویجدانـــە
خـــاوەنـــی تـــاقیق[1] مـــەردی مـــەیدانـــە
ویجـدان ئیدراکـە لـە بـۆ حاڵـی خـۆت
نیـسبەت بـە مـاڵ و بـە منداڵـی خـۆت
ئـــەوەی لـــە خۆتـــا ریعایـــەی ئـــەکـــەی
ئـەو حاڵـە بـۆ غـەیـر تـەماشـا بکـەی
کـاتێ ئـەم وەسـفە بـوو بـە ماڵـی تـۆ
بـوو بـە مـەلـەکـەی دوا حاڵـی تـۆ
ئـەوکاتـە بـەحـەق خـاوەن(ثقافـە)ی
خـاوەن کـەرامـە و خـاوەن شـەرافـەی
ئەگـەرنـا ئینـسان هـەر بـۆ خـۆی بـژی
وێـنەی حـەیوانـە حـەیـوانی کـەژی
خۆلاســـەی کـــەلام(ثقافـــە) بـــەرزە
مایـەی ئـارامی خـەڵـکی سـەر عـەرزە

---

[1] – بە مانای: ( تحقیق)ە

جـەدوەلـی عامـە لای نـەفـسی وریـا
بۆ مـەسـڵەحـەی عـام بـۆ دیـن و دنیـا
خـاوەن دەمـاران مـەڵـێ هۆشـیارن
سـورەت ئینـسانن بـەسـیرەت مـارن
رەحمـەت ئـەنـێرن بـۆ حاتـەمـی تـەی
لەسەر سەخاوەت لـە بـۆ ئـەهلـی حـەی
سەخاوەت بە عیلم بـۆ ئـەهلـی کـەمـاڵ
گـەلـێ چـاترە لـە سـەخـا بـە مـاڵ
(نـامی)تـابژی بـەعـەقـڵ و کـەمـاڵ
ئەڵێ هـەر بـژی مـەردی شـیرین حـاڵ

## ئەرژینت ئەوێ بە موسڵمانی

ئـەر ژینـت ئـەوێ بـە موسـڵمانی
سـیفەتـی ناسـاغ فـەرزە دەرمـانی
وەکـو پێویـستە بـۆ تـۆ خـوراکێ
مـەنـزڵ و مـاوا و بـەرگ و پۆشـاکێ
وەکـو پێویـستە دەرمـانی جـەسـتەت
پێویـستە دەوای دەروونـی خـەسـتەت
تایبەتی دەوای هـەوای نـەفـسی خـۆت
کەبووە بە هۆی جەفای شەخـسی خـۆت
بـووە بـە پایـە لـە بـۆ کیبریـا
بـۆ ئـەنانیـەت لـە چـەرخـی دنیـا
ئـەمجـارە چـارەی دەردی بـەد دڵـی
کـە بـەربـاد ئـەکـا مایـە و حاسـڵی

ئــەمجــارە دەردی حــەســەد و کینــە
لــە گــەڵــتان وێــنەی مــاری خــەزینــە
جیـــا نابنـــەوە لـــە وجـــودی تـــۆ
هــەتــا وەر ئــەگــرن بــۆی نــابوودی تــۆ
جــا بـــەدگومانیـــت لـــە موســـڵمانان
کــە دژن لــە بــۆ پــەیمــانی ئیمــان
بــاقی ســیفاتی ڕەزیلــەی نــەفــسی
دژمنـــی بـــارەی بـــارەگـــای قودســـی
هـــەتـــا ئـــەمانـــە هـــاوڕازن بـــۆ دڵ
پیـــرۆزی دڵـــت ناگـــا بـــە مـــەنـــزڵ
چـارەی ئـەمانـە فـەرزە بـۆ بـەشـەر
ئـەنـا دەرنـاچێ لـە پـردی سـەقـەر
چاری یـەکـەم جـار: فکرێـکە سـەلیم
لە یاسای ئیسلام بـۆ عـیلم و تـەعلیم
پایـــەی کیبریـــا هـــەر بـــۆ خودایـــە
ئـــەوە خـــالیقی هـــەمـــوو دنیایـــە
ماســـیوا زەعیـــف قیمـــەتـــی نییـــە
ئیتـــر(کبریـــا) مـــەوزوعـــی چیـــە؟
خـــودا موختـــارە لـــە (إِغطـــا) و (منـــع)ا
لـە عیـز و زیلـلا لـە (خـەفـض) و رەفعـا
دژی کـاری حـەق بـۆ بـە نـدە ناشـێ
واتـە ئـەبـێتە چـەقـەنـەی ئاشـێ
دووەم چـــار: ببـــڕێ لـــەم ســـیفاتانە
نـــەخۆشینـــێکن لـــەم رووی جیهانـــە

ئینسانی زانا خۆی نەخۆش ناکا
لە جێی خەتەرا خۆی بێهۆش ناکا
سێهەم چار: یاری[١] ئەهلی حیکمەتە
ئەوەی وتاری مایەی رەحمەتە
بەڵکو بە حیکمەت تەمێ وەر بگرێ
خۆی رزگار بکا و بەم دەردە نەمرێ
چاری چوارمین: ریازەی نەفسە
لەلای مورشیدێ کە خاوەن قودسە
نەزەری پیری دەروون نوورانی
ئەتکا بە نووری چاوی جیهانی
ئاخ بۆ ئیکسیرێ بۆ مسی دڵم
بکا بە ئاڵتون خاشاکی گڵم
کە چاری نەکرد مردنی فەرزە
تا بێگەن نەکا رووی ئەم سەر عەرزە
سیفاتی نابار لەسەر یاسای غەیب
گۆشتی مردووە بێ گومان و رەیب
بۆ خۆی بۆگەنە و هەتا بمێنێ
بۆگەن تر ئەبێ لەسەر زەمینێ
(نامی)زۆر بە دڵ ئەپارێتەوە
بەم بێنە پیسە نەتلێتەوە

[١] – دۆستایەتی، هاورێیەتی

## جار جار غەریبی

جارجـــار غـــەریبـــی دایـــی بـــۆ دڵـــم
تـــەنـــگ ئـــەبـــێ لا دڵ مـــاواو مـــەنزڵـــم
ئـــەم دنیـــا چـــەنـــێ پانـــەو گوشـــادە
لـــە دڵـــما وێـــنەی کـــورەی حـــەددادە[1]
جـــار بـــە جارێـــکیش ئـــێمەوە ســـەر خـــۆ
دڵ نەشـــە ئـــەکـــا بـــە چـــەن رەنـــگ و بـــۆ
ئـــەڵـــێ هـــۆ بـــرای بـــەدڵ غـــەریـــبم
بـــۆ دەردی دەروون وێـــنەی تـــەبیـــبم
کەس کەسی نییە کەس هـەر خۆیـەتـی
مایـــەی پیـــرۆزی و رەنـــگ و بۆیـــەتـــی
کـەس غـەریـب نییـە لـە کـورەی دنیـا
دنیـــا وەتـــەنـــە بـــۆ مـــەردی وریـــا
کەس غـەریـب نییـە لـە بـەنـی ئـادەم
نیـــشتمان عامـــە بـــۆ هـــەمـــوو عالـــەم
ئـــەر پـــەروەردگـــار بـــدا پیـــرۆزی
ئـــەگـــەی بـــە پایـــە و مایـــەی فیـــرۆزی
بـــێگانەی دنیـــا ئـــەبـــن بـــە بـــرات
بـــۆ شـــەوی تاریـــک ئـــەبـــن بـــە چـــرات
کە دەستی پێدای هەموو وێنەی دۆســت
دەورت لێ ئەدەن وێنەی کەوڵ و پۆســت

[1] – واتە کوورەی ئاسن گەر

کاتــێکیش لای‌دا بــۆ بــەدبــەختــی تــۆ
لە بۆ مەینــەت و بــۆ ســەرســەختــی تــۆ
عالـــەم بـــێزارە لـــە دەور و بـــەرت
کـــاتی مـــردنیش نایـــەنـــە ســـەرت
ئیتــر بــا بــەس بــێ عــەرز و حاڵــی تــۆ
خــەیاڵــی پــوچی بــێ کــەماڵــی تــۆ
ئاســمان شــینە و عــەرزیــش رەنگامــە
بــۆ یــەکــێ دڕکــەو یــەکــێ شــەمامــە
هەرمەیلی حــەقــە مایــەی ســەربــەرزی
هــەر لــە ئاسمان هــەتــا ســەر عــەرزی
یـــا خـــودا(نـــامی) بـــێتە خـــاوەن دڵ
تـــا بـــەم حاڵـــەوە بگـــا بـــە مـــەنـــزڵ
هەر خودا ناس بــێ تــا خــۆی ئــەناســێ
لــە ئــەوهــامی پــوچ ســەری نــەماســێ
ڕێگەی خۆی بگرێ ســاغ و ســەلامــەت
هـــەتـــا ئـــەگاتـــەخانـــەی قیامـــەت

### پەیامی سورەی «حەمد»

ئـــــێمە وەهامـــــان نیـــــشان دراوە
کــار هــەر بــە تــەدریــج تــەواو کــراوە
پلــە پلــەیــە کــەمــاڵ بــۆ نــاقیس
چەن مــەرحــەلــەیــە ئیخلاســی خــالیس
لــەگــەل ئــەوە دا بــە (کُــن فیکــون)
کــار تــەواو ئــەکــا خــودای کــاف و نــون

لـە شـەش روژا بـوو خـەلقـی کائینـات
عالـەمـی(سـُفْلی) و چـەرخـی(عُلْویـات)
(وَ اِنَّ یَومـــاً عِنـــدَ رَبِّکـــا)
(مَحْـسُوبُ عَلـــی غَیْـــرِ دأبِکـــا)[1]
تـولی پـێ نـەدەیـن خـودا خودایـە
کـاری لـە مـەخلـوق گـەلـێ جیایـە
پێیـشی نیـشان دایـن موناجـاتی خـۆی
تا هەرکەس مەقـسەد حاسـڵ ببێ بـۆی
لــەو فاتحـــەدا غـــوورڕەی قورئانـــە
کلیلـــی فـــەتحـــی دەرگـــای جیهانـــە
یەکەم جار بکـەیـن تـەبـرڕوک بـە نـاو
بـەر لـەوە مـە قـسود بهـێنینە نـاو
(تَوَسُـلْ) بکــەیــن بــە نــاوی زاتـــی
نــاوی جـــامیعی عولـــوی ســیفاتی
(الله) زاتـــێکی جـــامیع بـــۆ کـــەمـــال
لە وەسفی نەفسی و زاتیـیـە و ئـەفعـال
لە ناو هەمویـشا بـۆ مـوژدەی تـەعمـیم
جیلـوەیدا وەسـفی رەحمـان و رەحـیم
چـون میهـرەبانـە بـۆ گیـان لـەبـەران
بـە میقیاســی حـەق بـۆ رۆزگـاران

---

[1] واتە ئەو رۆژەی لای پەروەردگارت ئەو رۆژە ئاسایی و عادییەی لای تۆ نییە.

(وَكُـــلُّ شَـــيئٍ عِنْـــدَهُ بِمِقْـــدار)[١]
میزانـــە لـــە بـــۆ كـــاری رۆزگـــار
پـــاش ئـــەوە ســـوپاس بـــۆ پـــەروردگـــار
پـــەروەردگـــاری عالـــەمـــی هۆشـــیار
ئەفرادی ئـەسـناف ئـەسـنافی ئـەنـواع
ئەنـواعی ئـەجنـاس(فـی كـل الأوضـاع)
تـەكـرار خـوداوەنـد رەحمانـە و رەحـیم
بۆ ئەهلی تەكلیف بـە شـێوەی تـەعمـیم
بـە وەر گرتنـی تكـای پـڕ سـەمـەر
لـە رۆژی حـەشـرا لـە زاتـی رەهبـەر
ئـەمجـارە تكـای بـۆ تـاوان بـاران
رەحمـەت ئـەبـارێ بـە وێـنەی بـاران
ئـەمجـار بـۆ بـەرزی پایـەی پایـەدار
بـە گوێـرەی لـوتفی خـالیقی غـەففـار
هـەر خـۆی ئـەزانـێ ئـەو رۆژە چۆنـە
عـاقڵ لـەو رۆژا وێـنەی مـەجنوونـە
كـە سـوجدە ئـەبـا سـەییـدی سـەروەر
تـا نیـدای بـۆ دێ بـۆ تكـای بـەشـەر
هەروا تـەوسـیفی بـە وەسـفی (مالِـك)
لـە بـۆ ڕۆژی دیـن(صَـعْبُ المسـالِك)
لە پێـشا فـەرمـووی رەحمـان و رەحـیم
تـا دڵ دامـەزرێ بـە یاسـای تـەسـلیم

---

[١] – واتە هەموو شتێك لە لای خودا ئەندازەیەكی دیاری كراوی هەیە

ئـــەمجـــارە خیتـــاب بـــۆ زاتـــی بـــاری
بـــە یاســای ئــەدەب بــە عــورفی جــاری
اِیَــــــاکَ نَعْبُــــــدُ رَبَّ العـــــالَمِین
لَــــکَ الْعِبَــــادە بالقلــــبِ الآمـــــین
و ایــــــاک یــــــا ربنــــــا المعــــــین
فــــی المهمَــــات یَــــرا نــــستَعِین
ئــەوەی عیبــادەت لــە بــۆ ئــەو ئــەکــرێ
یارمــەتــی دەرە بــۆ هــەمــوو ئــەمــرێ
کــە ئــەمانــەت وت ئــەمجــار ئــەتــوانی
داوا بکــەی لــێی ئــەوەی ئــەی زانــی
لــە پــاش تــەقــدیمی ئــەو (مُقَــدِّمات)ە
نۆبــــەی ســــکالآت بــــۆ (مُهِمَــــات)ە
بــــلێ خودایــــا شــــارەزامــــان کــــەی
لە بۆ ڕێگەی ڕاســت هیدایــەتمان دەی
بەڵــکو چــەن قــەدەم بــڕۆین بــە ڕێــدا
نــــەمــــێنینەوە دامــــاو لــــە جــــێدا
لامــان دەی لــە کــوفر لــە تــاوان بــاری
لە دنیــای دوونــی هــۆی شــەرمــەســاری
بمان خەرە ســەر ڕێــی ئــەهلــی ئینعــام
یــــانێ ئــــەنبیــــا و روســــولی کیــــرام
یــانی شــا ڕێــگەی گــەلــی (صِــدِّیقِینْ)
گــەلــی (شُــهَدا) و گــەلــی (صــالِحِینْ)
ڕێــی(صِــدِّیقِینی) ســەداقــەت کــردار
ڕێــــگەی (شُــــهَدا)ی قیتــــالی کوففــــار

نەکرێگەی زانای بەدبەختی سەرسەخت
غەزەب لێ گیرا و لە وەخــت و نـاوەخـت
یــا رێــگەی گــرۆی نــەفــامی گــومراە
(أعاذنـــــــــا الله أعاذنـــــــــا الله)
(آمـین) ئــەی خــودای خــاوەن ئیجابــە
(مُجیـــب)ی دوعـــای ئـــەهلـــی (إصـابَە)
رەد مـــەکـــەرەوە رەببـــی دوعامـــان
بـــدە(حَـــسَنَە)ی هـــەر دوو دنیامـــان
ئـــەمـــە خۆلاســـەی (أمُ الْکِتابَـــە)
ئـەم رێـگە رێـگەی ئـەهلـی سـەوابـە
وابـــێرە مـــەیـــدان بـــۆ پاڕانـــەوە
لـــە بـــارەگـــادا بـــۆ لالانـــەوە
یـــانێ هـــەرکـــاتێ دڵ خوازێـــکت بـــوو
بـــە یاســـای ئـــەدەب بـــڕۆ زووبـــەزوو
هـەرچـە نـێ ئـە سـباب والـە ئیمکانـا
ئامـــادەی بکـــە لـــە رووی جیهانـــا
دوکتـــور و دەوا ســـەدەقـــە و دوعـــا
هـەمـوو ئـەمانـەن رێـگەی (اِسـتِدعا)
موقـــەددیمـــاتی بـــاش بـــسازێنن
بـــۆ رەحمـــی خـــودا خـــۆ بساچـــێنن
ئـــەوجارمومکینـــە کـــارت بـــۆ بکـــرێ
ســەبــەب ســازی تــۆ جـێگەیــە بگـرێ

ئــەپارێــتەوە (نــامی) بــە ئــیخلاس
بــۆ فــەوزی مــەرام بـۆ بـارەی خـەلاس

## کاکە حەقایق

کاکــە حــەقــایق قــسە و بــاس نییــە
لـەســەر ئـەوهـامی واتـەی نـاس نییـە
حـەقیقـەت لـەسـەر واقیعـی عـەینـە
عیلمـە یـا عـەمـەل ژینـە یـا شـەینـە
چاک ئەو کەسەیـە لای خـودا چـاک بـێ
پـاک ئـەوەتـانێ واقیعـەن پـاک بـێ
ئەنـا بـە واتـەی پـوچی(عَمْـر) و (زَیـدْ)
موێکی باریک لـێت ئـەبـێ بـە قـەیـد
سـۆفی ئـەوەیـە دەروونـی سـاف بـێ
دوور لـە نیفـاق و شـوبهە و خـیلاف بـێ
دوور بـێ لـە هـەوای دنیـای بـێ وەفـا
دوور بێ لە تـەمـاع دوور بـێ لـە جـەفـا
دەروێش ئـەوەیـە دەروونـی رێـش بـێ
بو تاعەتـی حـەق دائـیم لـە پـێش بـێ
مـەدح و زەممـی عـام بـە بـا بـزانێ
هـەر لـە بـەر خـودا بـێتە مـەیـدانێ
عـالم ئـەوەیـە خـاوەن عـەمـەل بـێ
لـە دنیـای فاسـید دوورە ئـەمـەل بـێ
ئـەوەی ئـەیـزانێ لـە بـۆ رەزای حـەق
بیکـا بـۆ عالـەم لـە هـەوا(مطلـق)

ئینسانی راستی ئەوەیە بە دڵ
حازر بێ لە بۆ حولولی موشکڵ
موشکیلاتی خەڵک بۆ خۆی بزانێ
تێکۆشێ بۆ حەل هەتا ئەتوانێ
برا ئەوەتە راستە برا بێ
لە تاریکیدا وێنەی چرا بێ
کاتێ کە مردی بێ تەمای میرات
خزمەتی ماڵت بکا بە خەڵات
ئەمەیە دەستوور بۆ دینی ئیسلام
ساغی بۆ خودا و بۆ خاس و بۆ عام
(نامی) هەر ئەوەی ئەوێ لە خودا
ئەو سەعیە ئەیکا بەزایە نەڕوا

**پێم بڵێن بۆ چی دین واگرانە**

پێم بڵێن بۆ چی دین واگرانە
ئەڵێی بارێکی قورسی سەرشانە
لەهەر شوێنێکدا باسی دینت کرد
بڵاوە ئەکەن چ گەورە چ ورد
وەڵام ئەمەیە کە نەوعی ئینسان
نەوعێکی خاسە لە جینسی حەیوان
پڕە لەفەرعی کەسافەی نەفسی
دورە لە وەزعی لەتافەی قودسی
دارای شەهوەتە و غەزەبی نەفسی
دارای لەزەتە و ئالامی شەخسی

چ شـەهـوەی جینـسی چ پایـە و مایـە
چ مـەبـەسـتی تـر بیکـا بـە غایـە
بڕوانـە بـۆ شـێر بـۆ ورچ و بـەراز
بۆ گورگ و چەقەڵ بۆ ڕێـوی ڕەنـگ بـاز
لـە بـۆ دوپـشک و مـاری بـێ ئامـان
لـە بـۆ درەنـدەی بـێ سـەر و سـامان
ئینـسانیش نـەوعـێ لـەم نـەوعانـەیـە
یـانی فـەرعـێکە لـەم فـەرعانـەیـە
ئەوەی مـەرغوبـە لای گـەلـی حـەیـوان
هەر وا مـەرغوبـە لای نـەوعـی ئینـسان
مـانیعی نییـە لـە کـاری نابـار
مـەگـەر مـەترسـی لـە زۆری(جَبّـار)
یـا هـێزی شـعور لـە بـەعـزێ کاتـا
نـەیێـڵێ بـڕوا بـە نـاو ئافاتـا
چون گیان لـە بـەرێ ئـەنجـام نـەزانـێ
لـەگـەل هـەوایـە هـەتـا بتـوانێ
تایبـەتـی کـاتی ئـارەزووی نـەفـسی
مەخسوس لە جۆشی شەهوەتی جینـسی
یـا لـەو کاتانـا کـە قـاری داهـات
بـێ نرخـەلـەلای هـەمـوو جینایـات
مـادام مـانیعێ بـەرگـری نـەبـێ
ئـەروا بـۆ دڵ خـواز بـبێ یـا نـەبـێ
عیلمـیش بـە جـەزای کـار و کـردەوە
نییـە لا ئـەوەی وابـە هـەردەوە

گەنجی خاوەن خوێن بۆ هەوای نەفسی
تاو ئـەدا وێـنەی رەش مـاری حـەبـسی
لـەگـەڵ بلێـسەی ئـاگری شـەهـوەت
چۆن چـاری ئـەکـا واتـە و نـەسیحەت
شـەخـسی برینـدار بـەشـێری دژمـن
چۆن ئارام ئـەگـرێ بـەدوو واتـەی مـن
ئینـسانی برسـی لای خـواردەمـەنـی
خـۆی پـێ نـاگیرێ بـۆ ئەرجومـەنـی
هـەر چـەن مانیعـە ترسـی حوکمـدار
ترسـی نامـێنێ رۆیـشتە کـەنـار
بـە کـورتی پـڕە لـە جیهـازی شـەڕ
ئەیبا و ئەیهـێنێ لـەوپـەڕ بـۆ ئـەم پـەڕ
جـا لـێرا دەرکـەوت پێویـستی ئـایین
هـەتـا لای بـدا لـە مایـەی نـەفـرین
تـا حاڵـی بکـا لـە تۆڵـەی عـەمـەل
لە ئەنجامی شـەڕ پـاش کـاتی ئـەجـەل
پـێی نیـشان بـدا دەرمـان و دەوا
بـۆ چـاری نـەفـس و بـۆ چـاری هـەوا
بـا حاڵـی بکـا لـە رۆژی عـەزاب
لـە سـەختـی ئـاگر لـە تـولی عیقـاب
نیـشانی بـدا(قـصُور)ی بـەهـەشـت
(حور) و (غلمان) و سرووری بـەهـەشـت
پـێی نیـشان بـدا جـەزای خـەیراتـی
کـاتی میحنـەتـی سـای عـەرەسـاتی

ئەوانـەی زانـی سـەر پـەسـەن ئـەبـێ
مـایلی کـاری ئـەرجومـەن ئـەبـێ
نـەک هـەمـوو بـەڵـکو لـە هـەزارا دوو
شـاباز یـەکـێکە و بـە سـەدهایـە بـوو[1]
ئەگەر ئەپرسی دیـن چـۆن دێـتە بـەر
لـە بـۆ ئیـسلاحی ئـەحواڵـی بـەشـەر
پێت ئەڵـێم مـەبـەس تـەخفیفی بـارە
ئـەگـەر نـا بـەشـەر گـەلێ بـێ عـارە
لە سەدا یەکێ بـە عـەقـڵی شـەخسی
چواریش بـە هـێزی ئـەنـواری قودسـی
ئـەگـەرێـنەوە بـە تـرس و تـەمـا
لـە سـەر ئیرشـادی عـەقـڵ و عولـەمـا
چـون سـاحیبی دیـن خـاوەن ئیعجـازە
بـە ئیعجـازە وا بـە ئیمتیـازە
خـاوەن تـەئـسیرە بـە هـێزی ئـەنـوار
ئـاگر بـەر ئـەدا لـە نـەفـسی ئـەشـرار
خـاوەن ئیرشـادە بـە عـیلم و حیکمـەت
دوعـا مـەقبوڵـە بـۆ جـەلبـی رەحمـەت
(مـدارا)ئـەکـا لـەگـەل خـاس و عـام
تـا شـارەزابـن بـۆ رێـگەی ئیـسلام
(الحاصـل) بـوونی رەسـول واجیبـە
بـۆ ئینـسان بـالای گـشت (مواهبـە)

---

[1] - کوندەبو

تــەئییــدی عقــول ئــەکــا بــۆ دنیــا
بــە وێــنەی چــرا لــە دەســتی وریــا
ئــادەم بــە رەهبــەر بــە نــووری غــەیبی
ئــەگــا بــە پایــە و مایــەی (لاریــب)ی
مونحەریف ئــەبــن لــە حیلــەی نــەفــسی
(مُــشَرَّف) ئــەبــن بــە نــووری قودســی
نوورێــکی (قائــد) بــۆ خــێری مــوهیم
(نــــورهم یــــسعی بــــین ایــــدیهم)
نوورێــــکی وەهــــا لــــێی نابــــێتەوە
بــەو رێــگەی تاریــک ڕوون ئــەبــێتەوە
(نــامی) بــە ســەفــای ئــەونــووره ســافه
لــە جــەفــای ڕۆژی مــەحــشەر (معافــه)

## نیزامی دین بە ئەخلاقە

ئەر کــەســێ بــڵێ لــە ســەر دڵ ســافی
عــەقــڵ بــۆ بــەشــەر کافییــە کــافی
لــەبــۆ ژیــانی لــە خــوار و لــە ژوور
لــە بــۆ دانــانی (نظــام) و دەســتوور
ئــەڵــێم براکــەم کــاکی دڵ ســادەم
عــەقــڵ دەلیلــە بــۆ بــەنــی ئــادەم
بــەڵام دەلیلــە لــە بــۆ بــازێ کــار
بــۆ یاســا و نیــزام بــۆ دێــهات و شــار
دەلیلــە لــە بــۆ تــەعمیــری دنیــا
دەلیلــە لــە بــۆ هــات و چــوی دەریــا

دەلیلــــە لــــە بـــۆ مـــاڵ و دارائـــــی
دەلیلـــە لـــە بـــۆ یاســـای زانـــائی
تەی ئەکـا بـە هـێز پانـائی سـەر عـەرز
ئەفـڕێ بـە سـاروخ بـۆ مـەقـامی بـەرز
بەڵام پیـوەنـدی قـەیـدی نـە فـسی‌یـە
پـەیـوەنـدی نییـە بـەوەی قودســی‌یـە
خـەبـەر دار نییـە لـە جیلـوەی ئـەنـوار
ئاگـادار نییـە لـە کـەشـفی ئـەسـرار
ئاگـــادار نییـــە لــــە پـــەروەردگـــار
خـەبـەردار نییـە لـە جـەزای کـردار
پێویـــستی هــــەیــــە بــــە دەلـــیلێ وا
وێـــرانەی دڵــــی پــــێ بـــبێ ئـــاوا
هــەڵــی سوڕێـنێ بـۆ نـا سـینی حـەق
بــۆ پــەروەردگــار تـــەوانـــای (مطلــق)
بـــبێ بـــە ســـیلەی ئینـــسانی زانـــا
لە بـەینـی مـاددە و ئـەسـراری مـەعنـا
رابیتـەی بـەینـی خـودا و بـەنـدە بـێ
واسـیتەی سـەفـای دڵـی زینـدە بـێ
یـــانی رەســـولێ لـــە لای خـــوداوە
فـــانی روو بکـــا بـــە لای بـــەقـــاوە
دەرزی ئــــادەمـــــی ســــادە دابــــدا
شـــارەزای بکـــا بـــۆ رێـــی ئیهتیــــدا
نیــــشانیان بـــدا حاڵـــی ئیعتیــــدال
بـــۆ دیـــن و دنیـــا بـــبن بـــە میـــسال

بــــزانن کـــــردار بـــێ جـــەزا نـــابێ
ڕووداوی عالـــەم بـــێ قـــەزا نـــابێ
ئـــەوەی ئـــادەمـــی ئـــەیکـــا لـــە دنیـــا
ئاگـــاداره لـــێی فریـــشتەی وریـــا
دەفتـــەری هـــەیـــە لـــە بـــۆ خـــێر و شـــەڕ
کێ خاوەن گەڕە و کێیـە سـەر بـەفـەڕ
هـــەتـــا تـــێ بگـــەن هـــەوا پـــەرستی
ئـــەنجـــامی نییـــە بـــێجگە لـــە پـــەستی
زانـــستێ نـــەبـــێ بـــە هـــۆی دڵـــسۆزی
بـــۆ بـــەشـــەر نـــابێ بـــە هـــۆی پیـــرۆزی
جـــا ئـــەوەی زاتـــەن خـــاوەن بـــاوەڕە
ئـــەوە هـــاوڕازی پیـــرۆزی و فـــەڕە
ئـــەوەیـــش پێویـــستی بـــێ بـــە بورهـــان
موعجیزەی ڕەسول بـۆی دێـتە عـەیـان
ئەوجار هەر کەسێ خۆی و شـیری خـۆی
خۆی و شعوری خۆش تـەدبیـری خـۆی
بـــەڵـــکو بـــۆ لای حـــەق لا بکاتـــەوە
ئـــەنجـــامی ژینـــی لیـــک بداتـــەوە
ئـەنـا هـەر بـژی بـەوێـنەی حـەیـوان
فـەرقـی نـاکرێ لـە وەحـشی کـێوان
بـەڵـکو بـەدتـره لـە دوپـشک و مـار
ئەوان بە یـەک بـار ئـەم بـە هـەزار بـار
جا هـەرکـەسـێ هـات بـەرەو ئیعتیـدال
بـــۆ دیـــن و دنیـــا ئـــەگـــا بـــە ئیقبـــاڵ

دنیـا بـەشـەرەف رائـە بـووریٚ لـەو
لـەو دنیاکـەیـشا ئـەگـا بـە پڕتـەو
ئـەگـەر نـا دنیـای ئـەڕوا بـە بۆشـی
قیامـەتیـشی دیٚ بـۆ نـاخۆشـی
(الحاصـل) بـوونی رەهبـەر واجیبـە
نـاردنی ڕەهبـەر لـە(مواهبـە)
له بەر چەن داعـی بـە دیـن موحتـاجین
موحتـاجی دەرزی بـەرزی میعـراجین
یـەکـەم: دەرزی دیـن یاسـای خودایـە
کـە بـە ئـەوزاعـی عالـەم زانایـە
ئـەزانـیٚ چۆنـە یاسـا بـۆ ژیـان
ژیانـیٚکی وا دوور بـیٚ لـە زیـان
ئـیٚمە ناقیـسین ئـەگـەر بیـزانین
بـەقـەی وەزعـی رۆژ خـاوەن عیرفـانین
یاسـامان بـەقـەی هـیٚزی ئینـسانه
هـیٚزی ئینـسانیش لـەسـەر نوقـسانه
بـەلاّم خـوداوەنـد خالیقـە و خـەبیـر
دانـای زاهیـرە و ئـەسـراری (ضـمیر)
خـودا ئـەتـوانیٚ یاسـائی رەسـا
دانـیٚ بـۆ عالـەم شـاگرد و وەسـا
بـۆ ئـەوشـتانەیـش ون بـیٚ لـەلامـان
ریٚـی ئیـستیدلالی دانـاوە بۆمـان
دوهـەم: غـەیبیـات غـەیبـە لـەلامـان
نـازانین حالّـی پاشـە ڕۆژمـان

ئەحواڵی مـردوو هـەر لـە پـاش مـردن
تـا(بعـث) و (حـشر) و حیـسابات کـردن
عـــەقـــڵی ئـــادەمـــی ناگـــا بـــەوانـــە
بـوون و نـەبوونیـان لـە لای یـەکـسانە
ئیقرار بە جەزایـش فـەرزە بـۆ بـەشـەر
هـەتـا خـۆی دەرکـا لـە کـاری خـەتـەر
سێهەم: مورسەلین مەنیـەعـن بـۆ نـوور
لـە بـۆ تـەنـویری مـەرکـەزی شـعور
وێـــنەی کـــارەبـــان بـــۆ دڵ و دەروون
کـارەبـای دڵـسۆز لـە هـەوای بیـروون
دڵ تـــا نـــەبـــرژێ بـــەو نـــووره خـــاوە
وەکـــوو بـــەرگـــێکی دەبـــاغ نـــەدراوە
بـــەوکـــارەبایـــە دڵـــێ چـــاک ئـــەبـــێ
شوێـــنی تـــاریکی لا ڕوونـــاک ئـــەبـــێ
هەرچەن عەقڵی عام ئەشێ بـۆ تـەدبیـر
دیـــن کـــارەبایـــە ئـــەیخاتـــە تـــەئـــسیر
یانێ عەقڵی عام بە بـێ عـەقـڵی دیـن
نـابێ بـە ڕەحمـەت لـە بـۆ عالـەمـین
ئـــەگـــەرموفیـــدبێ لـــە کائیناتـــا
لـــە(حـــسیّات)ا و لـــە عـــەقـــڵییاتا
هـەمـووی (محـصور)ە بـۆ ئـەو شـتانە
کـــە مـــاددە دارن لـــەم ڕوی جیهانـــە
ئیـدراکی غـەیبـی بـە عـەقـڵی دینـە
دڵـــسۆزی ژینـــە و پیـــرۆزی دینـــە

(نــامی) بــاوەری وایـــە بــا ئـــایین
هــەر ئــەو جامیعــە بــۆ دنیــا و بــۆ دیــن

**کونهی زاتی حەق لە عام نادیارە**

رەحمــەت لــە رۆحــی بــەرزی (غــزال)ی
لـــە شـــەو و رۆژا(علـــی التـــوالی)
بە واتــەی شــیرین ئــەڵێ بــە بــەشــەر
مەڕۆنــە دەریــای پــڕ خــوون و خــەتــەر
دەریــای کــونهی زات یــاکونهی ســیفات
پـــەروەردگـــاری هـــەمـــوو(کائنـــات)
چۆن مەکشوف ئــەبــێ بــە ئیــدراکی تــۆ
زاتـــێ کـــە دوورە لـــە(مـــلاک)ی تـــۆ
هـــێزی شـــعوری کـــەم و کـــوڕی تـــۆ
نـــووری ئیـــدراکی پـــڕ قـــسوری تـــۆ
کـــە (مُـــستفاد)ە و (نـــاقص)ە و (محـــدود)
چۆن(کاشف) ئــەبــێ لــە بــۆ لامــەحــدود
زاتـــێ(وجـــود)ی بـــێ(ابتـــدا)بـــێ
هـــەروا (بقـــا)یـــشی بـــێ(انتهـــا)بـــێ
(وجــود)ی (واجــب) بــەیــانێ بــێ لــەو
لامــەحدودیــەت شــانێ[1] بــێ بــۆ ئــەو
عـــەقـــڵی مـــەحـــدودی شـــێوە(مُقبَـــا)
لــەگــەل حــەددی ئــەو کجــا مــەرحــەبــا

---

[1] - شکۆه؛ تاج

هـەزار سـاڵ بـڕۆی بـەم پانـە دەشـتا
هـەروای لـە نوختـەی یـەکـەما هێـشتا
ئـەونـە بزانـە هـەمـوو ئاسـاری
دەلـیلن لـە بـۆ پـەروەردگـاری
خـودایی هـەیـە (واجِـبُ الوُجـودْ)
وَ هُـوَ الخـالِقُ لِكُـلِّ مَوْجـود
مـادام هـەر ئـەوە خـالیقی مـەوجـود
(فهـو الإ لـه الواحـدالمعبود)
مـادام تـۆ بژیـت بـەم دڵ سـافی‌یـە
ئـەم ئـەنـدازەیـە بـۆ تـۆ کـافی‌یـە
(نـامی) کـافی‌یـە تـەجـەلـلای ئـەنـوار
بـۆ ئیمـانی تـۆ بـە خـودای(سـتّار)

## هەرگیز مەپرسن لە(سرّ)ی قەدەر

هـەرگیـز مـەپرسـن لـە (سـرّ)ی قـەدەر
سـوئال و جـواب خـەتـەر لـە خـەتـەر
بـۆچ دروسـتی کـرد زەمـین و زەمـان
عـەرز و دەریـای دوور چـەرخـی ئاسـمان
ئـەستـێرە بـۆ چـی بـدرەوشـێنەوە
بـەهـەتـاوی رۆژ بگـەشـێنەوە
پێویـستی چیـە بـە بـوونی بـەشـەر
بـە دێـوو پـەری و فریـشتەی ئـەنـوەر
خـۆ ئـەو غـەنییـە لـە هـەمـوو عالـەم
نـەبـات و مـەعـدەن حـەیـوان و ئـادەم

چــون (ســڕ)ی قــەدەر خاســەی خودایــە
ئــەســــراری (تكـــوين)بـــێ ئینتیهایـــە
کەشــفی حــەقــایق بــۆ کــەون و مــەکــان
لــە ئــێمە دووره مــەگــەر بــە ئیمکـــان
ئـــەوەی مـــەعلوومـــە تـــەنیــا ئاســـاره
ئـــــەوەیـــــش دەلیلـــی پـــــەروەردگـــــاره
چــاوێ نــەبیــنێ چاڵــێ چــل گــەز دوور
دڵـــێ نـــەبیـــنێ ڕۆحـــی خـــاوەن نـــوور
چلــون تــێ ئــەگــا لــە (ســڕ)ی قــەدەر
چلـــۆن ئـــەزانـــێ (ماهیـــة)ی بـــەشـــەر
تۆ کــە عــاجز بــی لــە (ســڕ)ی (تكــوين)
چــۆن زانــا ئــەبــی بــە (ســڕ)ی تکــوین
لام و کــاف مــەکــە بــەلــەکــە بــۆ دڵ
تــا بــە دڵ پــاکی بگــەی بــە مــەنــزڵ
(ســڕ)ی (کــاف) و (نــون)لــەلای خودایــە
خیتــاب لــە ســوورەت هــەم موعــەممایــە
ئــەوەی کــە خــودا تــەعلیمــت نــەکــا
چلــۆن خــەیــالآت تــەسلیمت ئــەکــا
وَ قَـــــدْ عَلَّـــــمَ آدَمَ الأسْـــــماءْ
قـــد اجتبـــاه مـــن أهـــل الـــسماء
فعظمـــــه الملـــــك المعـــــصوم
واســـــتنكره ابلـــــيس المحـــــروم[1]

---

[1] واته لە دوای ئەوەی کە ناوی ناو نراوەکانی فێری ئادەم کرد وە لە نێو دانیشتوانی ئاسماندا هەڵــی

ئەگەر تەعلیمی خودا نەبوایە
ئەگەر ئادەمی خۆش نەویستایە
چلۆن تەعلیمی ناوانی ئەکرد
چلۆن فریشتە سوجدەی بۆ ئەبرد
مەسڵەحەت وایە زەحمەت نەکێشی
بەقەی بەرەی خۆت پێت رابکێشی
ئەنا بە دەستێ بیدەن بە دەمتا
دانت نامێنێ تا هەڵیان کێشی
(و ما أوتیتم)[1] بخوێنەرەوە
مە علوماتی خۆت ببینەرەوە
هەتا تێبگەی لە موستەوای خۆت
بەقەی ئەوە عیلم رێ ئەکەوێ بۆت
نەچاو بە تەنیا ئەبینێ جیهان
نە دڵ موحیتە بە(سر)ی نیهان
هەرکەس حەددیکی بۆ کراوەتەی
ئەدەب ئەوەیە ریعایەی بکەی
خودا بە(محض)ی ئیحسان و کەرەم
بە پایەی رەهبەر شەفیعی(أمم)
(نامی) بفامێ مەقامی ئیحسان
تا بێتە ریزی عولەمای ئینسان

---

بژارد فریشتە پاکەکانی خودا ریزیان لێ ناو شەیتانی بێ بەش لە لە رەحمی خوا ئینکاری شایستەگی ئادەمی کرد.

[1] – ئاماژەیە بەو ئایەتەی قورئانی کەریم کە ئەفەرموێ: هیچتان پێ نەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنها بەشێکی کەم نەبێت

## بزانن دینم

بــــزانن دیــــنم دینــــی ئیــــسلامه
دەســتوورم لــەســەر ئایــەی کــەلامــه
بــەو جــۆره رەهبــەر بــەیــانی فــەرمــوو
ئەسحاب وەریان گرت بۆ یاسای هــەمــوو
بــێجگه کیتــاب و ســوننەتــی رەهبــەر
دیــنم والــه ســەر قــەراری ئــەکــسەر
واتــه ئــەگــەر دیــن هاتــه ســەر ئیجمــاع
ئیجمــــاع دەلیلــــه و نامــــێنێ نیــــزاع
ئــەر(اجمــاع) نــەبــوو دیــنم والــەســەر
ئــاڕای ئــەکــسەری زانــای موعتــەبــەر
ئــەوەی دامــەزرا بــە ئــەکــسەرییــەت
ئــــایینی منــــه هــــەتــــا قیامــــەت
بــۆ فــەرقــی فــەزڵ و شــەرەفــی عیبــاد
به ئــەکــسەرییــەت ئــەگــەی بــه رەشــاد
چۆنیــان فــەرمــووه ئــەو قــەولــه حــەقــه
چــرای ئیرشــادی حــەقــی موتــڵەقــه
واقیعــــەن ئــێمه ئــەڕوانــین بۆیــان
لــێک ئــەدەینــەوه واتــەی هــەموویــان
ئەر مەبــەس لــه فــەزڵ ســەوابــی کــاره
ئــــەمــــەعائیــــدی عیلمــــی(غفــــاره)
غــەیــری زاتــی حــەق ئــەوه نــازانێ
هیچکــەس تەحدیــدی ئــەوه نــاتوانێ

چونکێ یەک عەمەڵ لەلای دوو ئینسان
بە زاهیر یەکن یەک شێوە و یەکسان
فەرقی جەزایان (ثرا)[1] و (ثریا)[2]
وەکو فەرموویە شاهی ئەنبیا
ئەر مەقسەد شێوەی ڕەفتاری مەردە
لەو ڕەفتارانە شایستەی فەردە
لە سەرفی رۆح و سەرفی دارائی
یا ئەخلاقی بەرز بۆ ئاشنائی
وەکوو زەحمەتی جیهاد و ئیرشاد
لە بۆ ئیسلاحی ئەحواڵی عیباد
یا کارێکی وا لە بۆ موستەقبەل
بۆ ئیسلام باش بێ ئەحسەن و ئەفزەل
بەراستی ئەوەی خاوەن ئینسافە
فەزڵ بەم مەعنا دوور لە خیلافە
چونکێ ئەعمالی گەورە مەردەکان
دیارن لەلای مەردە فەردەکان
بوێ بڕیاریان دابە شەرافەت
بۆ ڕێزی بەرزی پایەی خەلافەت
باوەڕمان وایە ئێمەیش بێ میریە[3]
کە حەقیقەتە رێی ئەکسەرییە

[1] - خاک؛ خۆڵ
[2] - کۆمەڵە ئەستێرەیەکی رشتەبەندن لە ئاسماندا
[3] - بێ گومان

ئـەو خـەلافـەتـەیـش چلـۆن هاتـە جـێ
حـەقـێ بـو سـەریـح کـارێ بـو بـەجـێ
(امـــرُهُم شـــوری بَیـــنَهُم)[١] راســـە
دەســتوری عامــە نــەک یاســای خاســە
ئەگــەر ئیجمــاع بــوو عــەینــی مــەتـڵوبە
ئــەکــسەرییــەت بــوو هــەروا مــەرغوبــە
ئیتــر لــەم کــارا خــیلاف بـــێ ســـوودە
پەیڕەویـی ئایـەت عـەینـی مـەقـسودە
(نامی) بە نــووری پــەیڕەویــی ســەلــەف
میانــەی وەرگــرت نــەک ڕێــگەی تــەرەف

## رۆحی خەلافەت

(لاتَجتَمِـــــعُ اُمَّتـــــی عَلـــــی
ضـلاله)[٢] بــەســە بــۆ ئــەهلــی (غــلا)
خودای میهرەبان ویستی بــە رەحمــەت
هەموو شەم[٣] بکەن رەوحی خــەلافــەت
چــونکی خــەلافــەت بــۆ(رســول الله)
خــەلافــەی حــەقــە بــۆ زاتــی خــودا
(انـــی جاعـــلُ فـــی الأرضِ خلیفـــه)[٤]
بــێنی لــەم باغــا گــەلــێ لــەتیفــە

---

[١] - با کارو بارتان بە ڕاوێژ بێت. بەشێکە لە ئایەتی٨٥ ی سورەتی (شوری)

[٢] - واتە ئوممەتی من لە سەر گومراهی کۆ نابێتۆ.

[٣] - بۆن بکەن

[٤] - خوای پەروەردگار بە فریشتەکانی فەرمو دروست ئەکەم لە زەویدا جێ نشین ئایەی ٣٠ (بقره)

رەببــی لــە بــێنی بــاغی خــەلافــە
بــەش دارمــان بکــە بــێ بــەڵا و ئافــە
تــا(نــامی) بــۆنێ لــەو باغــە بکــا
بــەڵــکو بــەو بــێنە بــە مــوراد بگــا

## ئینسانی راساڵ

ئینــسانی راســاڵ لــە ســەر رووی دنیــا
ڕووی لــە خودایــە بــە تــاقی تــەنیــا
هــەر ڕەهبــەرێ بــێت بــۆ ئــەم جیهانــە
هــەمــوو خــادمی دینــی یــەزدانــە
دڵتان تــێک نــەچــێ بــۆ تــەمــای دنیا
خــۆ مــەهاوێــنە ناوگــێژی دەریــا
زاهیــر و بــاتن پــاک بــن لــە تــاوان
بە دڵ بــە داوێــن بــە دەس بــە زمــان
دەخیل سەد دەخیل بــە دڵ هۆشــیار بــن
لە مێژووی عالەم بــاش خــەبــەردار بــن
تــاریخی راســتی ســادقان دانــاو[1]
نەک واتەی گەلــی سیاســەت شــەقــاو
هــەتــا بــزانن کــە ئیــسلام کامــە
ڕێــگەی ســوننەت و جــەماعــەی عامــە
بــە کــوردی ئــەڵــێم فــەرزە موســڵمان
بــاوەڕی بــبێ بــە ئایــەی قورئــان

---

[1]– واتە ئەو مێژووە ڕاستەی کە ڕاست وێژان نووسیویانە

باوەڕی ببێ بە ڕێگەی ڕەهبەر
بیکا بە جادە ئەمسەر تا ئەوسەر
هەرگیز لانەدا لە مەعنای زاهیر
بە بێ دەلیلی قاتعی قاهیر
ئینسانی وەها ئەهلی سوننەتە
داخڵی باغی بەرزی جەننەتە
کەسێ لابدا لە (نص)ی قورئان
لە (نص)ی حەدیس بێ هێزی بورهان
یا ئەهلی بیدعەت گومڕای حەقیقە
لای داوە لە سەر پانی تەریقە
یا خود کافرە و بەندەی شەیتانە
لە گەڵ شەیتانا بەستەی قەیتانە
درۆو دەلەسە و چاوەڕاو کردن
بە هەوا داوای ناتەواو کردن
ناشێ بۆ زومرەی ئوممەتی ئیسلام
(والله یَهدِی سَبیل السَلام)
چەن هاوارم کرد هەم هاوار ئەکەم
تاریخ بزانن لە زۆر و لە کەم
سیرەتی ڕەسول ئادابی یاران
بکەن بەسەرمەشق بۆ ڕۆزگاران
دامەزرێن لەسەر ڕێگەی جەماعەت
دووربن لە یاسای ئەربابی بیدعەت

هەرکەس بەو ڕێدا بڕوا راجی‌یە[١]
بکەوێتە ناو فیرقەی ناجی‌یە
(نامی)باوەڕی وەهایە بەدڵ
بەرێی سوننەتا ئەگاتە مەنزڵ

## سیڕڕی دروست بوونی مەخلوقات

ئیجادی فەرموو خالیقی عالەم
مەعدەن و نەبات حەیوان[٢] بە سەرجەم
لە حەیواناتا بە مەحزی تەشریف
ئینسانی ژیر کرد بۆ فامی تەکلیف
زات و سیفەتی غەریزەی ئەسناف
دای بە ئادەمی شایستەی ئیشراف
ئەوجار تەکلیفی لی کرد بە تاعەت
هەتا بگاتە پایەی سەعادەت
لەسەر ئەم یاسا مەجمووعەی سیفەت
شەهوەت و غەزەب هێزی مەعریفەت
کردی بە مەنبەع بۆ جیلوەی ئاسار
مایەی پیرۆزی یا دەرد و ئازار
ئەوانیش هەموو لازمی زاتن
ئەعرازی قەریب لەزاتیاتن
دەی ئەو ئەوسافە هەرگیز ناگۆڕێن
یا ئاسمانان بە چەپ بسوڕێن

---

[١] -واتە: هیوای ئەوەی هەیە

[٢] – لە نوسخە خەتیەکەدا (حیوانو) نووسراوە بو نەزمی شیعرەکە نووسیومانە (حەیوان)

بەڵێ بە تـرس و تـەمـێ و تـەربـی‌یـە
بە هێزی عـەقـڵ و عـادە و تـەزکـی‌یـە
ئاسـارەکانیـان ئـەگـۆڕێ بـە چـاک
ئـەبـن بـە مایـە بـۆکردەوەی پـاک
ئـەنـا ئـەساسـی ئـەو سـیفەتانـە
هـەر وەهـا مـاون لـە جـێی خۆیانـە
بـڕینی دەسـتی نـەفـسی سـتەمکـار
دان دەرهـێنانە بـۆ مـاری نابـار
دانـی دەرچـووە ئـەگـەرنـا خـۆ مـار
تـێرە لـە ژاری پـڕ دەرد و ئـازار
بـە وێـنەی کـەسـێ چـاوی نـەبیـنێ
نـازانێ هـەنگـاو بـۆ کـوێ هـەڵ بـێنێ
کـاتێ کـە مـانیع نـەمـا لـە لایـان
بەچکەی موحتـاجن بـە شـیری دایـان
بە هـەمـوو جـۆرێ شـیر هـەڵ ئـەمژن
شیریان پێ نەدەی فەورەن ئـەتـکـوژن
بـاش ئاگـادار بـن پـۆلا پۆلایـە
سـارا سـارایە و قـەلا قـەلایـە
زەحمـەتـە فـەنـای سـیفاتی زاتـی
چ مـازی و چ حـاڵ چ کـاتی ئـاتی
بـەلام هـەر فـەرزە تـەمـێ وەربگـرین
لەو سـاتۆ ئـەبـین هـەتـاکو ئـەمـرین
بەڵـکو تـا ئـەفـسەد بـبێ بـە فاسـید
ساڵێ رزگـار بـین لـە شـەری حاسـید

بــە وێــنەی تــووتی کــە تالیمــت کــرد
دێـــنە وت و وێـــژ بـــە وتـــاری ورد
عالەم بــە فــەیـزی تــەعلـیم ئــەمـێنێ
بــە نــووری تــالیم تــەسـلیم ئــەمـێنێ
(نــامی) تــەماشــای ئــەم دنیایــە کــرد
هــێنایە دەســـتی گـــەلـــێ بـــەراورد
لای(لاتبـــــــدیل لخلـــــــقِ الله)[1]
حیکمەتی حــەقــە بــۆ گــەورە و بــۆ ورد

## مەکینەی قەزا هەر وا لە ئیشا

مــەکینــەی قــەزا هــەر والــە ئیــشا
شەخسی نــاڕەزایــش والــە تــەشویـشا
ئارامیــت ئــەوێ شـــانە هــەڵ بگـــرە
کـــاتێ پێویـــستە بـــێنیە بـــەڕیـــشا
خــوا مــاتڵ نــابێ لــە کــرداری خــۆی
هــەروا ئــادەمـیش لــە رەفتــاری خــۆی
بازێ سوود ئەبـا و بــازێ ســۆی جگــەر
بــازێ ئــەمـێنێ و بــازێ پــڕ خــەتــەر
نــەگبــەتــی بــازێ لــە کــردەکــاران
نیعمــەتــە و رەحمــەت بــۆ بــوردەبــاران
ئـــەسورێـــتەوە ئاســـمان بـــە دەو
هــەر چــەرخێکیــشی رۆژێــکە لــە نــەو

---

[1] – واتە: کاری خودا و دروستکراوی خودا هیچ گۆڕانکارییەک بەسەریدا نایەت (الروم٣٠)

ئەوەی کار ئەکا بار ئەگرێ بەتەو
ئەوەیش نوستوە لە خەرمانی خەو
هەرکەسێ بەهرەی کاری خۆی ئەگرێ
شەخسی بێکاریش بەزاری ئەمرێ
دنیا ئەگۆڕێ بەکردەوەی گەل
بە عیلم و عەمەل بە یەکیەتی و هەل
هەر نمێ باران لەسەر بێتە خوار
بەقەی دەریایێ پڕە لە ئەسرار
عەجیبە نمێ بێتە دەریایێ
گەوهەری تیابێ بەقەی دنیایێ
کائینات پڕە لە ئاساری حەق
مادەن بۆ باوەڕ بە فەردی موتڵەق
جا ئازابە خۆت روو لە خودا بە
بۆکردەوەی باش خاوەن سەودابە
ئەوەی پێیداوی لە هۆش و زانست
بیکە بە زادی مەردی حەق پەرست
ئەگەرنا واتەی بێ مەعنا و بێتام
نەدانی چیشتە و نەخوێیە و نەتام
بی سوودە سەد ساڵ هەودا بڕێسی
ئەگەرلە یاسای خودا نەپرسی
ئادەمی وێنەی گەنجی تەلیسمە
ئادەم موسەمما و ئادەمی ئیسمە
فاتیحی تەلیسم عیلمە و عەمەلە
لەگەل هیوای خێر یانی ئەمەلە

مــەوجــوود خودایــە و عیبــادی خــودا
ئــەو خــۆی واجیبــە و مــومکین ماســیوا
زانــا بــەو هۆشــیار رێــک بخــە تۆشــە
ئەگــەرنــا واتــەی بــێ ســەمــەر بۆشــە
عــیلم و عــەمــەلــت میراتــی تۆیــە
ئەگەر پــەســەن بــن رەحمــەتــت بۆیــە
(نــامی)چــاوەرێــی ســەمــع و تاعــەتــە
ئــەگــەرلــە منــەو ئــەگــەر لــە تۆیــە

## گەلێ سیفەت هەن

گەلــی ســیفەت هــەن ئــەبــن بــە بــەڵا
ئــادەم دەر دێــنن لــە بــەســتی قــەڵا
یــەکــەم بــایی بــوون ئــەت دا بــە بــادا
جــێگەت نایێــڵێ لـــە ڕووی دنیـــادا
ئینــسانی بــایی هــەرگیــز دەرنــاچێ
لــە دەســتی قــەزا تــادای ئــەپــاچێ
ئەگەر بڕواتە ســەر تــەختــی (کیــسری)
ئەونــە ئــەزانــێ دەرگــای لــێ بــەســرا
لە پاش بایی بــوون ڕەشــە بــای هــەوا
بــە لاَت بــۆ ئــێنی لــە نیــوەی شــەوا
بـــۆ هــــەمــــوو دەردێ قابیلـــە دەوا
مــەگـــەر بـــۆ وەبـــای نابـــاری هـــەوا
هـــەوایـــە ئینــسان بـــەرز ئـــەکاتـــەوە
لــە ئــەوجــی فــەلــەک دای ئــەخاتــەوە

هەوایـە ئـەت بـا بـۆ کـردەوەی زشـت
پشتت نایێلێ جـا ئـەت دا بـە کوشـت
هـەوا لـە دنیـا ئـەت خاتـە نـاو عـار
لـە ئـاخیرەتـا ئـەتبـا لـە بـۆ نـار
هـەوایـە ئـادەم ئـەکـا بـە هاوپـشت
بۆ گـومرا کـانی بـەدی بـەد سروشـت
هـەوا ون ئـەکـا رێـگەی بـەهـەشـتت
ئەت خاتە سەر ڕێی دووزەخـی زشـتت
هــەوا گیــرۆدەت ئــەکــا بــە درۆ
قیمــەت نایێــلێ بــۆ چــاوو بــرۆ
هـەوایـە ئینـسان ئـەخاتـە تـەلبـیس
ئـەیکـا بـە بـرای هاوپـشتی ئیبلـیس
هـەوایـە ئـەیبـا شـەرەف و نـاموس
ئـەبـێ بـە دوژمـن بـۆ بـەرزی نفـوس
هــەواخــوای هــەوا ســیا چــارەیــە
لــە دنیــا و دینــا هــەر ئــاوارەیــە
(نــامی)ئــەناڵــێ بــە دوای فــەرزا
ڕەشــە بـای هـەوا نـەی دا بـە عـەرزا

## ئینسان بێ (یاسا) و بێ (گەورە) ناژی

قەت دامەنیشن مەگەر بـە هـەڵـکەوت
لـە نـاو ئـاوایی بـێ مـەلا و مزگـەوت
موســڵمان نــاژی بــەبــێ عیبــادەت
عیبادەت نابێ بێ مـەلای خـۆش ڕەوت

هەروا جێ مەگرن لە جێی بێ سامان
یانێ بێ گەورەی پەنای لێ قەومان
شوێنی بێ سامان ئەمانی نییە
ئەهلەکەی ئەمرن بێ دین و ئیمان
وڵات بێ سامان گەورە بێ ئامان
خەڵکی بێ شەرت و بێ عەهد و پەیمان
ئەگەر بە هەڵکەوت کەوتیتە ناوی
دەرچۆ با نەمری بێ سەر و سامان
هەڵچوون و داچوون بۆ هەرزەکاران
مایەی نەگبەتە لە رۆزگاران
ئادەمی فەرزە لەسەر یاسا بێ
یاسا بۆ دین و بۆ دنیا و سامان
دەب دەبە دەب دەب بۆ بێ ئەدەبە
ئەگەر لە عەجەم یا لە عەرەبە
هەرکارێ دەرچوو لە یاسای شەرعی
ئەو کارە حەتمەن بۆ بێ ئەدەبە
پیاو و ژن تێکەڵ لە ڕەش بەڵەکە
ئەگەر لە مزگەوت یا لە فەلەکە
دین مومکین نییە بەڕوی بێ دینی
خیلافی مەشروع هەمووی کەڵەکە
لە کاری شە رعی وەفا یێتە دەر
بە وێنەی داری سێبەر و سەمەر
کاری ناشەرعی مایەی جەفایە
لە دێ و لە شارا و لە ماڵا و لەدەر

(نـــامی) لاخـــودا رجـــای وەهایـــە
لەگەڵ شەرعـا بـێ بـە سـیدق و پایـە
پیـــرۆزی بـــەشـــەر وا لـــەگـــەل دینـا
ئینـسانی بـــێ دیـن ئـەروا بـــێ مایـە

## ئینسان بێ ئوستاد

ئینـسان بـــێ ئوسـتاد ناگـا بـە ڕەشـاد
راشـید بـێ کـەمـاڵ ناگـا بـە ئیرشـاد
هـەزار سـاڵ تـەواو لـە دەرگـا دا بـێ
هـەزاریـش لـە نـاو بـارەگـادا بـێ
بـە بـێ تـەربیـەی موڕشـیدی کـامڵ
ئینـسان ناگاتـە خـەرمـانی حاسـڵ
موڕشـیدی واسـڵ بـە فـەنـا و بـەقـا
(واصـل) بـە پایـەی پـڕ مایـەی لیقـا
زاهیر و بـاتین بـە وێـنەی بـەحـرەیـن
ببێ بە مەجمەع لـە بـۆ عـیلم و عـەیـن
لـەسـەر ئیجـازەی سـەییـدی ئـەنـام
ئیزنـی پـێ بـدرێ بـۆ ئیرشـادی عـام
(واصـل) بـە پایـەی (الهـام) و (اعـلام)
کـامڵ بـۆ مایـەی میللـەتـی ئیـسلام
مورشیدێـــکی وا خـــودا بناســـێ
وەکـوو ئـەحواڵـی موریـد ئـەناسـێ
ئەحواڵی موريد مەكـشووف بـێ لـەلای
بەفەیزی خـودا و نـووری تـەجـەلـلای

ئەمجــار تــەوژمــی تــەوەججـوهی ئــەو
دڵــی موریــدان پــڕ کــا لــە پــەرتــەو
نـــوورانی بکـــا دەروونــــی موریــــد
هەموو لەتــائیف بــە شــێوەی تــەحدیـد
هــەتــاکو حــوزور بــۆی بــبێ بــەمــاڵ
ڕۆژ بــە ڕۆژ بــروا بــەرە و ڕوی کــەمــاڵ
فــەرامــۆش بکــا بــە نــووری ئیــدراک
عەلاقەی نەفــسی ئــاو و هــەوا و خــاک
بگـــەشــــێتەوە دڵــــی بـــە ئـــەنـــوار
لــێ بــدا نــەشــئەی ئیــدراکی ئــەسـرار
لـــەتیفـــەی دڵ و ڕۆح و ســـیرڕی ئـــەو
هەم خەفی و ئیخفای[1] پڕ بن لە پەرتــەو
لەتیفەی پەســتی تــەبیعــە و نــەفــسی
مونــەووەر بــبن بــە نــووری قودســـی
وا ئـــارام بـــبێ نـــەفـــسی لـــە هـــەوا
لا نـــەکاتـــەوە بـــە لای (ماســـوی)
لەهەر شوێـــنی بــێ عــەتــری دەروونــی
ســیرایەت بکــا بــۆ مــاددەی بــوونی
نوکتـــەیـــێ هـــەیـــە لـــێرا بزانـــە
خـــودا ڕەحیمـــە و خـــودا ڕەحمانـــە
ئـــەجـــری عـــامیلان بـــە زایـــە نـــادا
چ لــــەم زەمانـــا چ لـــەو زەمانـــا

---

[1] – لە نوسخە خەتیەکەدا (خفی اخفایە) نووسراوە.

ئەجـر بـە[١] گوێـرەی ئیخلاسـە بـۆ دڵ
دڵ بـەبـێ ئـیخلاس ناگـا بـە حاسـڵ
بێ سـەبـەب نـابێ ئیخلاسـی دەروون
ئـەیـەوێ فـەیـزی مورشـیدی کـامڵ
(وَتَعـــاوَنوا) بـــە دڵ بخوێـــنە
عەونـی مـەعنـەوی بـە حـەق بنوێـنە
مابەینـی عـەونـی مـادی و مـەعنـەوی
سـەمـا و زەمینـە بـە فکـری قـەوی
هەرچەن (تَصوّف) کـەسـبە بـۆ مـەردان
بەڵام مـەکـسووبە بـۆ گـەلـێ فـەردان
هـەزار(صـناع)ی لـە چـەرخـی دنیـا
ناگـا بـە پایـەی دەروونـی وریـا
نـەشـئەی ئـەوانـە دنیـا دائـەگـرێ
دڵـی زینـدوویان هـەرگیـز نـامرێ
زەوقـە نـەفحـەیـە رەوحـە رەیحانـە
نەشئەی نیـسبەتـی قودسـی ڕەحمانـە
(انّـــی اجـــد نفـــسَ الرحمـــان)
بۆ ئەم مـەبـەسـتە بۆرهانـە و (ضـمان)
سـاتێ ئولفـەتـی رۆحـی ئـەمانـە
نرخـی تاعـەتـی سـەد سـاڵ زەمانـە
سـیرڕی ئـەمیـشە ئـەمـەیـە ئـەوان
خاوەن عەلاقـەن بـە شـاهی عـەدنـان

---

[١] – لە نوسخە خەتیەکەدا( اجر بو گویرەی) نووسراوە.

هەر لە ئـەساسـا بـە دڵ تـێ گـەیـین
لە سیرِڕی تاعەت لە مایـەی تـەمکـین
حاڵی بـوون بـە حـەق ئیقتیـدایان بـەو
جالبـە و جـازب بـۆ نـووری پـەرتـەو
پەیوەنـدی‌یـان کـرد بـە رابیتـەی رۆح
حاسـڵ بـوو بۆیـان مـە قـامی فتـووح
تـــەفـــاوت زۆرە لـــە پایـــەی ناســـی
لـــەگـــەڵ رۆحـــا بـــێ یالـــەش بناســـی
خالیـدە بـە حـەق عـەلاقـەی ئـەرواح
یـەکـە لـەلایـان (مَـساء) و (صَـباح)
دڵیان (مظهر) بـوو بـۆ نـووری رەسـول
چـرای کائینـات وەسـیلەی (وُصـول)
بـوین بـە ویـنەی حـامی زەرەبـین
گـەیـشتە عالـەم ئـەنـواری ئـەمـین
هەروا هـەر کـەسـێ خـودا پـێداو بـوو
لە سـەیـری دنیـا روشـدی تـەواو بـوو
کـەوتـە ژیـر ئـالآی ئـەو شـابازانە
دەرچـوون لـە جـەفـا گـورج و ئازانـە
هەروا قەف قەف هات ئـەنـواری (طاهـا)
بوو بـە هـۆی بـەرزی لـە پایـە و جاهـا
هـەمـوو هـەر نـووری (رسـول‌الله)یـە
وا بـڵاوە بـوو بـۆ ئـەم دنیایـە
یـا میـری میـران یـا پیـران پیـرم
بـۆ دیـن و دنیـا هـەرتـۆی دەسـگیرم

لە دەستی پەستی و جـەهـلا ئـەسـیرم
کەوتووی بـێ هـێزم گـەلـێ فـەقیـرم
تۆی نووری ئەنوار تۆی سیڕڕی ئەسـرار
تۆی رۆحی ئەڕواح بۆ زومـرەی ئـەبـرار
تۆی مورشید بە حەق بۆ ئەهلـی عالـەم
تۆی تاجی عیـززەت بـۆ بـەنـی ئـادەم
بـــە شـــەفاعـــەتـــی پـــێدراوی تـــۆ
بـــە(بـــابُ الرَّحمـــە)ی واکـــراوی تـــۆ
بـــەنـــدەی ناقیـــسی ناتـــەواوی تـــۆ
دابـێ بـە بـەنـدەی خـاوەن نـاوی تـۆ
لـــە کـــوێ دابگـــرم وێـــرانە مـــەنـــزڵ
روو بکەم لـە کـوێ کـوێ مـاوە بـۆ دڵ
مایـــەی ئـــارامیم هـــەر دڵـــە هـــەر دڵ
ئـەگـەر نـووری تـۆ بیکـا بـە مـەنـزڵ
دڵ بـــە قوربـــانی زمـــانی فـــەسـیحت
بـــەڵا گـــەردانـــی وەجهـــی مـــەلیحـــت
بـــە گۆشـــەی چـــاوێ لابکـــەرەوە
تا شیفای بۆ بـێ بـەنـدەی جـەریحـت
میلیـــارێ میلیـــار ســـەڵات و ســـەلام
لەسەر رۆحی تۆ ئـەی مـەولای ئـەنـام
پـەنـای هـێناوە (نـامی) بـۆ حـوزوور
بۆ روناکی دڵ بـەیـەک شـوعلەی نـوور

## مەعشوقە زۆرن

مــەعــشوقە زۆرن لــەم رووی دنیایــە
تــەنیــا یــەکــێکیان خــاوەن بــەقایــە
یەکــەمــین مــەعــشووق زاتــی خودایــە
جیلــوەی جــەماڵــی فــەردی تــەنیایــە
بازێ کەس ئەڵێن عاشق بوون بــە زات
عائیدی عــەشــقە بــۆ جیلــوەی ســیفات
عــەشــقی تــەجــەلای ســیفاتی زاتــی
جیلـــوەی ئاســـاری رووی کائینـــاتی
عــەشــق بــە عیلمــی رەســای شامــڵی
عــەشــقی قــودرەتــی بــاڵای کامــڵی
عەشقی ئیرادەی بــۆ هــەرچــی ویــستی
ئــەبــێ بــێتەجــێ لــە بــاڵا و پــەســتی
عەشقی ســەمیعــی و بــەســیری عــامی
بـــۆ کائینـــاتی خـــاوەن دەوامـــی
عـــەشـــقی کـــەلامـــی (لامتنـــاهی)
(اخبـــار)و(انـــشاء)(ئـــامر) و (نـــاهی)
عەشقی حیکمــەتــی هــەمــوو کــرداری
لــەگــەل ئــەســراری هــەمــوو ئاســاری
عــەشــقی ئــەفعــالی بــە مــەعنــا ڕەزا
بۆ سوود و زیــان بــێ ســەختــی و ســزا
ئــەگــەر زەڕڕاتــی وجــوودی هــەمــوو
ببـــڕن لانـــەدا لـــە رەزا بـــە مـــوو

ئەم عەشقە عەشقی گەورە مەردانە
نەک هەموو مەردان بەڵ بۆ فەردانە
بازێکیش ئەڵێن ئەمانە هەموو
لادانە لە عەشق بۆ مەدلوولی هو
عەشق هەر عەشقە لە بۆ زاتی ئەو
بەفەنای (مطلق) بە جیلوەی پەرتەو
ئەگەرنا عەشقی ئاساری سیفات
دوورە لە مەعنای عاشقی بۆ زات
دووهەمین عەشقی خاوەن ئیرشادە
یانێ ئەو زاتەی (خیرالعبادە)
ئەوە (مظهر)ە بۆ ئەنواری حەق
ئەوە (مظهر)ە بۆ ئەسراری حەق
ئەوە مەکینەی کارەبای نوورە
ئەوە واسیتەی شەرحی (صُدور)ە
ئەوە مەرکەزە و وایەر بە میلیار
دەر ئەچێ بۆلای ئەرواحی ئەبرار
ئەوە (رحمةللعالمین)ە
لەسەر تەبلیغی ئەحکام ئەمینە
موسڵمان نییە لائەو بێ بەش بێ
مەگەر دەروونی سەراسەر غەش بێ
بە پێی ویسعەتی دەروونی ئەبرار
نووری ئەو رۆژە دێ لەسەر تیکرار
لەم عەشقەوە دێ نەسیبی عیباد
عەشقی موریدین بۆ خاوەن ئیرشاد

لە مورید نووری لە مورادیش نوور
دێن بە سەریەکا (نورٌ علی نور)
ماڵو دەر و دەشت تا پاڵوی کۆسار
هەموو پڕ ئەبن لە جیلوەی ئەنوار
لەم عەشقەوەیە عەشقی شاگردان
لەگەڵ ڕۆحیەی گەورەی ئوستادان
دوور نییە شاگرد بمرێ بە فیراق
فیراقی مەولای بەرجەستەی ئافاق
لەم عەشقەوەیە عەشقی ئەهلی دین
لە خزمەت کاری لە بۆ (مُسلمین)
عەشقی موسڵمان لە بۆ هەرکارێ
سوودی حاسڵ بێ بۆ بەختیارێ
وەکوو تەعلیم و تەربیەی ئینسان
وەکوو یارمەتی بۆ کاری ئیحسان
وەکوو دڵسۆزی ڕەحمەت و ئینساف
لەگەڵ مابـاقی ئاساری(اوصاف)
بوونی ئینسانی(موصوف) بە ئیمان
قەت خاڵی نابێ لە نووری ئیحسان
هەموو دێنە خوار لەو عەینە بەرزە
ئەڕژێنە سەردڵ لە رووی ئەم عەرزە
یەکەمین بەشی لەم عەشقە جوانە
هەر عەشقی عیلمە باشی بزانە
عیلم ئەساسە بۆ بینای ئیسلام
عیلم پایەیە بۆ بەقای (نِظام)

عـــیلم کـــە نـــەمـــا دنیـــا تاریکـــە
ڕێـــگەی پیـــرۆزی دوور و باریکـــە
بەم عیلمە ئەگەی بـە مایـەی نـەجـاح
بەم عیلمە ئەگـەی بـە پایـەی ئیـسلاح
دارائـــی ئینـــسان ئـــەوەی موهیممـــە
بـبێ بـە فیـدای کـەمـێ لـەم عیلمـە
بـەهـەر بـەعزێـکی دائـەنـێ خـشتێ
بۆ (رَوْضە)ی بەرزەخ بەر لە بـەهـەشـتێ
عەشقی سێ هەمین ئارەزووی نـەفـسە
ئەم عەشقە غـەیـری عاشـقی قودسـە
(زُیّـن للنـاس) ئـەبـێ بـە تـەفـسیر
بۆ قیسمی سێهەم بێ توولوو تـەقـسیر
عەشقی عەشیقە و غـەرامـی عـەفیـف
عەشقی ئەولادی نـەجیـب و شـەریـف
عەشقی جـاه و مـاڵ بـۆ ڕێـگەی خـودا
بـەشـێکی خـێرن ئـەر خـودا بیـدا
غـەیـری ئـەمانـە هـەمـووی هـەوایـە
هـێرشی هـەوای ڕوو لـە فـەنایـە
(نـامی) لـە خـودا ئـەپارێـتەوە
بـە هـەوای جـەفـا نـەتلـێتەوە

## تەریقەی مەردان لەسەر ڕەفتار بوو

تەریقەی مەردان لـەسـەر ڕەفتـار بـوو
لەسەر پـەیڕەوی شـاهی موختـار بـوو

لـەسـەر سـلووکی ئـادابی حـەق بـوو
لـەسـەر بـێزاری هـەوای ناحـەق بـوو
لـەسـەر ڕیـازە و تـەنـویری دڵ بـوو
هەموو بۆ حەللـی هـەوای موشـکڵ بـوو
لەسەر تەزکیـەی نـەفـسی دەنـی بـوو
بـۆ دووری لـە بـا و بـۆی ئـەنـانی بـوو
لـەسـەر زاهیـدی و تـەرکـی دنیـا بـوو
لـەسـەر خزمـەتـی دینـی خـودا بـوو
دوور بوو لە مەکر و حیلە لـەگـەل نـاس
نزیک بو لە هـۆی ئیحـسان و ئـیخلاس
ئەهلی تـەریقـەت بـە عیبـادەت بـوون
تالبی جومعە و هەم جـەماعـەت بـوون
(ذکـر) و (تهلیلـە) و شـەو نوێـژ و ڕۆژو
خامۆشی لەبـاس هـەرا و هـات و چـوو
جـا نـوور ئـەبـاری بـۆ سـینە و دڵـیان
ئەبوو بە باخـات تـەکیـە و مـەنزڵـیان
موریدان ئەغڵەب خاوەن سـەفـا بـوون
بە(صدق) و (إخـلاص) ڕوو لە وەفا بـوون
بازێ ئەهلی حاڵ بـە کـەڕامـەت بـوون
بێزار لە پەستی و بای نـەدامـەت بـوون
موریـد وەکـو شـێخ ئـەهلـی کـشومات
زاهیـر و بـاتن دوور لـە خوڕافـات
هـەمـوو ئـاگـادار لـە (واجـب)ی دیـن
هەموو خەبـەردار لـە ڕێـگەی یـەقـین

کـە دنیـا گـەڕا بـەبـێوەی عـەییـار
کـراوە ڕێـگەی هـات و چـوو بـۆ شـار
چینێ پەیدا بوو لـە نـەسـڵی شـەریـف
لـەلای شـەیتاتـا کـران بـە عـەریـف
(خلـــف خلـــف اضـــاعوا الـــصلا)[١]
تاوانیـــان ئـــەکـــرد بـــە ڕۆژ بـــەرمـــەلا
لـەم چـەرخـا (طریـق) بـو بـە میراتـی
بـوو بـە چـاوەڕاو لاخـۆر هـەلاتـی
کـاتێ بابـە مـرد جـێ نـشینی هـات
بێ فەرقی مزگەوت لـەگـەل خـەرابـات
بـێ فـەرقـی عـیلم و زانـا و نـەزانـا
بـێ فـەرقـی عـاجیز لـەگـەل تـەوانـا
وەکـو تـەریقـەی بـۆ هـات بـە میـرات
موریـــدیش هـــاتن ولات بـــە ولات
موریـدی دامـاو بـێ عـیلم و نـەزان
بێ خەبەر لە گشت مەگەر چێشت و نان
نوێـژ و عـەقیـدە ئـادابی ئیـسلام
بوو بـە بـەر چـاوی شـەراب و تـەعـام
جا ئەگەر یـارۆی وەلـی عـەهـدی بـاب
تۆزی بـە ئـەدەب بـێتە سـەر حیـساب
ئادابـێکی دیـن بێنـێتە بـەر چـاو
نوێـژە فـەرزەکـان بکـەن بـە تـەواو

[١] - مانای ئەم چەند ڕستە لە پێشدا ڕابورد

دڵــیان رابگــرن بــۆ مــەوعیــزەی دیــن
(فالحمـــــــدُ للهِ ربِ العـــــــالمین)
ئــەگــەر نــەمــاوە بــەغــەیــری غــەوغــا
ئـــێمە بـــێ چـــارین (الحکـــم لله)
(نـــامی) تالیبــــە بـــۆ ئامۆژگـــاری
بــە هیــوای عــەفــویی خــالقی بــاری

## هەی داد بازێ کەس وێنەی نەخۆشە

هەی داد بازێ کەس وێنەی نــەخۆشــە
ئەر نــەخــۆش نییــە بــۆچی بــێهۆشــە
تــەماشــا ئــەکــەی بــە شــەوو بــە ڕۆژ
بۆ هــەرزەکــاری وێــنەی ســەر خۆشــە
بــە شــەو گیــرۆدەی خــەیاڵــی خــاوە
بــە رۆژا کــاتی بــۆ عــەیــش و نۆشــە
ساتێ برسی بــێ ئــەگــری پــڕ بــە دەم
کــاتێ تــێری خــوارد حاڵــی پــەرۆشــە
پــڕە لــە هــەوا ســەر تــا بــە قــەدەم
کــە تــێی ئــەفکــری دەمــاخی بۆشــە
غەرقە لە دەریای غــەفــڵەت و جــەهــلا
بــێ زەوق و ئــولفــەت وێــنەی وحوشــە
لــە دوورۆ وێــنەی قوببــەی تــەڵایــە
نزیــک بویتــەوە عــەهــدی مــەنقووشــە
ڕازاوەتــەوە بــە خـــەت و بــە خـــاڵ
ورد ئـــەبیتـــەوە بـــەردی مـــەنقوشـــە

وا لـە نـاو قـەسـری بـەرزی حـەیاتـا
کەچی قەسرەکەی قـەبـری مـەنبوشـە
لای مــەلا شــێخە و لای شــێخا مــەلا
لا هەر دوو ســووکە بــە وەزنــی پووشــە
بــە دەم خــاوەنــی خــەرمــانێ پاکــە
بـــە دڵ حاســـڵی هێـــشتا کـــڵۆشە
بە سوورەت جەمعە و نووختەی مەرکەزە
بــە ســیرەت دەوری دائیــرەی بۆشــە
کــاتی تــەنیــائی وتــاری تاڵـــە
لـــەنـــاو کۆمـــەڵا وتـــاری خۆشـــە
ئارامــە کــاتی بــێ دەســتی بــەڵام
کاتێ دەستی بوو ئـەسـپی چـەمۆشـە[1]
بـــە دەم زاهیـــد و تـــاریکی دنیـــا
کـەچـی بـۆ دنیـا وێـنەی حـەوخۆشـە
برا با بەس بـێ مـەسـتی هـەتـا کـەی
تا کـەی بـۆ هـەوا ئـەم کـرد و کۆشـە
هــەتــا میزانــت نــەیــەتــە راســتی
راســتیت ناڕاســته خۆشــیت ناخۆشــە
بـێرەوە بـۆ ســەر ڕێـگەی هۆشــیاری
مـەخـزەنـت پڕکـە لـە تیکـەی تۆشـە
خـودا (خبیـر)ە بـە ئـەحواڵـی گـشت
ئـەگـەر تـەمـەڵـە ئـەگـەر تـێکۆشە

---

[1] – سەرشێت

پۆشاکی ئەمـڕۆت هـەرچـەن ئـەلوانـە
بەرگی سـبەیـنێ سـپی و سـەر پۆشـە
(نامی) با بـەس بـێ تـۆ هـەم لـەوانـی
ئەوەیـش هۆشـیارە هێـشتا نـەخۆشـە

## راگری ڕازم

راگـــری ڕازم بـــۆ پـــەنجـــا بـــەهـــار
راگـــری نـــازی خوێـــشان و ئـــەغیـــار
هاورێی غەریبی لەم شـار بـۆ ئـەو شـار
دەوای تـــەبیـــبم لـــە دەرد و ئـــازار
لەسەر دۆعای خۆت ئازاد بووی لـە ژیـن
لـــە ژیینـــی دنیـــای پـــڕ لـــە ژاریمـــار
یا خـوا ئـازاد بـی لـە حـەقـی مابـەیـن
شاد بی بـەڕەحمـی خـوای پـەروەردگـار
هـەرچـەن مـەلـوولم لـەم کـارەسـاتە
پڕ گـــەردەلوولـــە دڵـــەی دەردەدار
بـەڵام هـەر ڕازیـم بـە قـەزای خـودا
حـوکمی حیکمـەتـە و خـاوەن ئیعتیبـار
هـــەزاران هـــۆرە و هـــەزاران هـــاوار
ســـەد سیاپۆشـــی لـــە پارچـــەی دەوار
ســەد هـەزار دانـەی ئـەسـری یـاقوتی
لە جۆشـی سینەی سـیرەت سـەمـاوار
بە هەوری سـەقفـی سـەمـای دەماغـت
بگریـــت بـــە وێـــنەی بـــارانی بـــەهـــار

سەد جار لەسەر و سینەی خۆت بدەی
یا خۆت لە قوڕنێی لەسەر تا بە خوار
یا تەرکی نان و ئاوی خۆت بکەی
شەو تا بەیانی بەیان تا شەوگار
یا تەرکی کەسب و کاری خۆت بکەی
گۆشە نشین بی لە پەنای دیوار
یەک پەنجە قەزا لاناکاتەوە
بۆ دەوای دەردی دڵی سوگەوار
خۆ لەملایشەوە دۆستان بە دوو دەس
ئەدەن بە سەردا لە دەس رۆزگار
دژمنیش بۆ خۆی لەب خەندە ئەکا
بە شاد کامی هەوای نابەکار
لا خودایشەوە ئەجرت ئەفەوتێ
دەستت ناکەوێ یەکێ لە میلیار
بەڵام ئەگەر تۆ (صابر) بێ بەدڵ
بۆ قەزای خودای (قادر)ی(قهّار)
ئەجرت ئەنووسێ خامەی نامەی حەق
یەک پایە تا سەد سەد تا سەد هەزار
دەی بۆ خۆت دەرچۆ بۆ کار و بارت
بژی بە خۆشی بە دڵی هۆشیار
هەتا سیحەتی قەلب و قاڵبت
بمێنێتەوە بۆ تۆ بەر قەرار
رووداوی کۆچی دایکی منداڵان
رەفیقی عومر و دەوا بۆ ئازار

شەوی چوارشەمەی چواردەی(صَفَر)بــوو
عــەزمـــی ســەفـــەری بـــۆ(دارُالقـــرار)
بـــۆ ئـــەوەی لـــەگـــەل ئـــاوارە نـــەبـــێ
لە دێی چنارەی مـەڵـبەنـدی ئـەسـرار
لەلای گۆرخانەی بـاوک و دایکـی خـۆی
(روضە)ی رەحمەت بوو بە جێی (استقرار)
تـاریخی هیجـری هـەزار و چـوار سـەد
لـەگـەل سـێ سـالاً کـەسـری ئیعتیبـار
(ئامینــە) یــاخوا رۆحـت ئـەمـین بـێ
گــورەکــەت بــبێ بـــە بــاخ و گوڵــزار
(نامی) لـە پـاش تـۆ چـەن رۆژێ ئـەژی
ژیـان مـەحـدودە بـە لـەیـل و نـەهـار

قەبری ئامینە بەرەحمـەت بـێ وا لـە رۆژ ئـاوای حـەساری مەرقەدی شێخ نیزامی‌یەوە بە مەسافەی پـەنجـا هـەنگـاوێ وە لەوکاتا دەفنمان کرد لە خواریە وە قەبر نەبوو.

## پشت بە خوا بەستن

هــەرگیــز نــەنـازی بــە شــان و بــالاً
بـــە دۆســـت و بـــرا مالـــو منـــدالاً
ئـەمانـە هـەرچـەن هـەمـوو ئـەسبابن
بـە بـێ موسـەبیـب دوور لـە حیـسابن

بـــە زهـــد معبـــود چ کنـــد محمـــود
بـۆ فـەوزی مـوراد بگـە بـە مـەقـسوود

ئیعتیمــــاد لـــەســـەر زاتـــی خودایـــە
ئــەیــاز و مــەحمــوود دوورن لــە غایــە

هــەزار ئــەســبابت لــە بــۆ رێــکەوێ
خواستی خوا نەبــێ هــیچ دەس ناکــەوێ
خواستی هـاتــەجــێ کـارت بــە جــێیــە
چونکــە فــەرمــانی شــاهانەت پــێیــە

نمــێ لــە ئــاوی دەریــای رەحمــەتــت
کافییــە بــۆ مــن لــە جــێی نیعمــەتــت
بــەو نمــە ئــاوە لــێوم تــەڕ ئــەبــێ
دڵــم مــەشــمولی فــەیــز و فــەڕ ئــەبــێ

هەر خۆتی خودا پــەنــا و مــەلجــای مــن
هــەرخــۆتی جیگــەی نــزا و رجــای مــن
دنیــا ئــاگر بــێ دڵــــم ناترســـێ
ئــەگــەر لــوتفی تــۆ لــە مــن بپرســێ

ئــەگــەر لــوتفی تــۆ بــێتە پــشتیوان
نــوح لــە دەریــادا دێ بــۆ کــەشــتیوان
بــاغ و بێــستانت مــە عمــووره و ئــاوان
کــە خــدری زینــدە بــێتە دەشــتەوان

خــودا حــامی بــێ (محــامی)م نــاوێ
کۆمــەکــی ئــاری یــا ســامیم نــاوێ
خــوا مودافیعــە لــە ئــەهلــی ئیمــان
بە پیێ تەجرەبــە چــەن کــەڕەت دیمــان

ئـادەم بـە ڕاسـتی ئـەڕوا بـە ڕێـدا
ئینـسانی بـێ پـێ هـەر وا لـە جـێدا
ڕێگەی ڕاسـتە ڕێ لـە بـۆ خـۆت بگـرە
بـەهانـەی درۆ لـە عالـەم مـەگـرە

(نـامی) هـەر لـە خـۆی عیتـابی هـەیـە
ڕەخنـە و سـوئال و جـوابی هـەیـە
ئـەگـەر نـا خـودا حـەکیمـی عامـە
دائـیم تـەجـەلـلای لـەسـەر ئینعامـە

**سەڵاوات لەسەر ڕۆحی پێغەمەر**

سـەڵاوات لـەسـەر ڕۆحـی پـێغەمـەر
وەکـو بـارانی بـەهـاری (أخـضر)
ئـەوەنـدە پایـەی بـەرزە بـە ڕاسـی
کـە ئـەوت ناسـی خـودا ئـەناسـی

ئـەوەنـدە بـەرزە بـە خـودا ناسـی
مورشـیدە لـە بـۆ (مطیـع و عاصـی)
ئـەوە پـێی وتـین خـودا خودایـە
وجـوودی فـەرزە و تاقـە و تـەنیایـە

هەموو مومکینات لـەوۆ مـەوجـوود بـوون
بە نووری پاکی وجوود مـەسـعوود بـوون
شـارەزای کـردین بـۆ عـەقـڵ و شـعور
بـۆ فـەرقـی کـوفر و ئیـسلامی (منـصور)

کردینـی بـە خـاک لـە ڕێـگەی حـەق‌دا
بـە فیـدای سـەفـای نـووری(مُطلـق)دا
ئـەوەنـدە بـەرزە بـووی بـە ئـوممـەتـی
ئـەڕۆیتـە سـایەی ئـاڵای ڕەحمـەتـی

بـا تـاوان بـار بـی بـە بـاری خـەتـا
کـەرەم ئـەبـێتە سـەتتـاری خـەتـا
خودا ئـەو پـەردەی سـەتـری ئیحـسانە
لا نـەبـەی لـەسـەر ئـەم نائینـسانە

چەن نەقدی زایف کـە بـێ قیمـەت بـوو
لەناو ڕەواجـا بـە حـەق مـەسـرەف بـوو
سـەد سـەلام لـەسـەر زاتـی پـێغەمـەر
(رئـوف و رحـیم) دەلیـل و ڕەهبـەر

هـەم لـەسـەر ئـاڵ و یـارانی پـاکی
لـەسـەر پـەیـڕەوی ئـایینی چـاکی
تـا وجـوود هـەیـە لـە ڕوی ئیمکانـا
تـا مـەکـین هـەیـە لـەسـەر مـەکانـا

(نامی)بـە سـەفـای هـەتـاوی ڕووی تـۆ
بـە بـای شـەماڵـی حاڵـی وەفـای تـۆ
ئـەژێـت و ئـەمـرێ و زینـدوو ئـەبـێتۆ
سەد جار دەری کەی سەدوو یـەک دێـتۆ

## دنیا هەر رۆژێ لەسەر دەورێکە

ئــەم دنیــا وێــنەی چــەرخــی دۆڵابــە
دۆڵاب هــەڵــسورێن خــودای وەهھابــە
هــەر ســاتێ ســەتــرێ وا لــە مــەیــدانا
یـــانێ شـــەوو ڕۆژ پـــەڕەی کیتابـــە

ســاتێ ئــارامی و عــەیــش و شــادی یــە
ســاقی و بــادەیــە و جــامی شــەرابــە
ســاقی مــەجــالی هیدایــەی حــەقــە
عالــەم بــە جــارێ رووی لــە میحرابــە

دەنگی زیکری حەق ئـەگـا بـە فـەلـەک
مەلەک بـوو (ذاکـر) وێـنەی ئـەسـحابە
هــەرکــوێ ئــەڕوانــی هــەر چراخانــە
جلوســی پاشـــای عـــالی جـــەنابـــە

رۆژێـــکیش دنیـــا پـــڕە لـــە ماتـــەم
هــەرکــوێ ئــەڕوانــی زاری و عــەزابــە
نــە ئــەو پایــەدار نــە ئــەم بــەردەوام
هەمــووی ســەرەیــە و لــەســەر حیــسابە

هــەمــووی حیکمــەتــە لــەســەر میزانــە
هەمووی(صحیح)ە و هــەمــووی (صــواب)ە
ئــێمە فــەلــسەفــەی نــازانین چییــە
هـــەمـــووی داخـــڵی (أمُ الکتـــاب)ە

خەڵـکیش ئـەوەنـدە غافـڵن لـە حـەق
ئـەڵـێی دەم وشـکی ڕوو لـەسـەرابـە
کە دنیای بـۆ هـات وا بـۆی هـار ئـەبێ
نـە ڕێـی شـعورە و نـەجـێی(خطـاب)ە

وا سەرخۆش ئەبێ ئـەڵـێی چـل ساڵـە
شـەوو ڕۆژ لـەگـەل پیاڵـەی شـەڕابـە
ئەداتە شـێوەی شـوومی سـەرمـەستی
هەمـوو مـەبـەسـتی بـەسـتە و ڕووبابـە

(نـامی) مـەبـەسـتی بـەرزی جـەنابـە
چون پەسـتی بـاری (بئس الحـساب)ە
ڕەببـی حیـسابت عـەرز بـێ بۆمـان
بـە تکـای ئـەو شـای عـالی جـەنابـە

## هاوار لە دەستت

هـاوار لـە دەسـتت کـاکی شـەلاتـی
مـن نـازانم تـۆ لـە کوێـوە هـاتی
تـۆ سـەرقـەتـاری لـە بـۆ نـەگبـەتـی
یـا خـود دەلیلـی لـە بـۆ نـەهـاتی

شەلاتـی یـانێ گـوێ بـە کـەس نـەدەر
سەربەست و سەرمەست وەک خەرابـاتی
بـێ بـاک لـەیاسـای قـەدیـم و تـازە
بـێ عـار و بـێ کـار ڕوو بـەرەولاتـی

لــەکــاتی خۆشــا کــاری ڕەنــدی یــە
کــاتی زویــریش پــەرۆشــی و مــاتی
دەریــا لــەلای ئــەو کاســەیــێ ئــاوە
لــەبــەر نــەفــامی و بــێ دەســتەڵاتــی

گــەنجــی کائینــات بــدەیتــە دەســتی
سووک ئەیفەوتێنێ و ئــەمــرێ بــەلاتــی
دنیــا خــەرمــان بــێ بــۆ ڕزق و ڕۆزی
بــۆ ئــەو ئــەنوێــنێ بــە ساڵــی قــاتی

نــە دیــن نــە ئیمــان نــە ئــاوو پــەیمــان
نــە بیــرووڕای شــار نــە ڕێــی دێــهاتی
ئەونــە بــێ ئیــشە لــەبــەر حاڵــی خــۆی
بــێ فــەرقــە لــەلای هــات و نــەهــاتی

بــبن بــە ڕەفــێق لــە بــۆ کــەوە مــار
مــەبــن بــە هــاو ڕێ لــە بــۆ شــەلاتــی
ئــەخــلاق نامــێنی لــەلای هــاودەمــی
لــەبــەر بــەدخــویی و پــەســتی ســیفاتی

هــەرخــۆی ئــەبیــنێ ئــەویــش ناتــەواو
دوورە لــــە خـــودا و دەرزی ئایـــاتی
قــەت چــاوی چــارەی ئــەدەب نــابینێ
دوورە لــە حــەیــا مــاوەی حــەیــاتی

گیانداریــکن بــە ســەر ئــەجوڵــێن
بــەریــن لــە عــەقــڵ و (مُکَمَّــلاتِ)ی

بۆیــە وا (نــامی) بــە هــاوار ئــەڵــێ
دووربــن لــە گــەردی مــەردی شــەلاتــی

### هاو ڕێی باش ڕاگرە

بــبن بــە هــاوڕێ بــۆ خــاوەن یاســا
بــۆ شــەخــسی ژیــری زیــرەکــی ڕەسـا
بــۆ جــوانی خــاوەن پــەیمــان و ئیمــان
بــو ئینــسانی راســت زاهیــر و پــەنهــان

ئینسانــێکی وا خــاوەن شــعوور بــێ
عەقڵی بــەوێــنەی کــارە بــای نــوور بــێ
حــاکمی ڕۆحــی خــاوەن تــەدبیــر بــێ
وەزیــری عــەقــڵی ڕاویــژی پیــر بــێ

هەر کارێ ئــەکــا لــە ســەر تــەدبیــر بــێ
لــەســەر ڕاویــژی مــەردی خــەبیــر بــێ
لــێک بداتــەوە ئــەنجــامی کــاری
قیمــەت و پایــەی ســوود و خــەســاری

بهێڵــێتەوە ڕێــگە بــۆ ڕیجعــەت
بــۆ کــاتی نــەهــات یــانێ هــەزیمــەت
لــەگــەڵ دژمنــا بــەشــی دڵــداری
رابگــرێ لــە بــۆ ســاتی ئــەدبــاری

لــەگــەڵ دۆســتانا (معتــدل) کــار بــێ
نــەبــا لــە ئــەوان توشــی خــەســار بــێ

هەرکەس میانەی نەبێ لە ژینا
خەسارەت بارە لە دنیا و دینا

هەرچەن بە زاهیر ئازا و وریایە
هەناسە ساردی هەر دوو دنیایە
چون بێ ئیعتیدال وا لە تەرەفا
ئەگەرساغیش بێ والە تەلەفا

ئەگەر دەستت کەوت رەفێقێکی‌وا
میانەکار بێ بێ هۆسە و هەوا
بیکە بە برای دنیا و دینی خۆت
بیکە بە هاورێ لە بۆ ژینی خۆت

(نامی)لە ژینا لە پیاوی کامل
گەلێ خێری دی (عاجل و آجل)
لە بێ عەقڵانیش مار پێیەوە دا
بوین وا هاوار ئەکا لە خودا

## ئاخ لە ئادەمی

ئاخ لە ئادەمی چەن ناحیسابە
چەن دوور لە نووری مەعنای کیتابە
نەمدی ئینسانێ کە رۆژی بۆ هات
بڵێ لە دووی رۆژ شەویش حیسابە

وەها ئەزانێ ئەم چەرخە هەمووی
بە فەرمانی ئەو وێنەی دۆڵابە

نـازانێ کـە چـەرخ مـەئمـووری حـەقـە
بـە ئـەمـری خـودا سـەر لـە عـەزابـە

ئـەغـڵەب نابـاری چـەرخـی ئـادەمـی
لـەسـەر(عـصیان)ی حـوکمی کیتابـە
بە تەمێ و تەسکین لە سەر یاسای حـەق
ئینـسان سـالیکی رێـگەی(صـواب)ە

سەراسـەر جیهـان وێـنەی قـەسرێـکە
لـەو قـەسـرا ئینـسان خـاوەن حیـسابە
لـە هـەر قـەڕنیـکدا چیـنێ پـێ ئـەگـا
تـەمـێ کـراوە بـە دایـە و بابـە

تـەمـێ فاسـید بـوو نـابن بـە ئینـسان
دنیـایش سـەراسـەر رووی لـە خرابـە
تـا بـە بـەراورد بیـر ئـەکـەنـەوە
عالـەم گیـرۆدەی بـەڵا و عـەزابـە

ئەوان گۆشتی بەرخ ئەکـەن بـە کـەبـاب
عالـەمـیش بـەوان چـەرگـی کـەبابـە
نـازانن گـەلـێ رووی لـە تـاوان بـێ
یەقـین ئـە و گـەلـە رووی لـە عـەزابـە

(إذا أردنـا ) شـەرتـە بـێ گۆمـان
جوملـەی(اَمَرنـا) بـۆ ئـەو جوابـە[1]

[1] - ئاماژەیە بە ئایەی ١٦ لە ئیسراء(وَإِذَا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً)

ئـەم دنیـا تـا سـەر لـە بـۆ کـەس نییـە
(لِکُـــلِّ اُمَّـــە اَجَـــل)کیتابـــە

نـەزان بـایی‌یـە بـە رۆڵـەی خـەڵـکی
بـەچکـەی بـێگانە سـەر بـەرە و بابـە
پەروەردەی بکـەی بـە شـیر و شـەکـەر
ئـەو هـەر ئـارەزوی مـەزە و شـەڕابـە

نـــازانن مایـــەی پیـــرۆزی ئینـــسان
هـــەمـــووی(مـــسطور)ی (امُّ الکتـــاب)ە[1]
نـە دارایـی‌یـە نـە جـاە نـە پایـە
هەرخواسـتی خـودا ئـەسـڵی (نیـصاب)ە

یـــارۆ نـــەزانـــە یـــا زانـــای (اُمـــور)
خـــاوەن(نثـــر) و (نظـــم) خـــاوەن ئادابـــە
هـــەوڵـــی ئـــەوەیـــە بگـــا بـــە یـــاری
بـەحـەق ڕێـڕەوی ڕێـگەی (صـواب)ە

سـەد بـرای راسـاڵ بـەکـەم بزانـە
یەکـێ بـەدخـوو بـێ بـەسـەد حیـسابە
سـەد دۆسـت بـبێ هێـشتا هـەرکـەمـە
بـە تـەنیـا دژێ دڵ لـە عـەزابـە

هەرچـی هۆشـیار بـێ لـە رووی جیهانـا
مـەسـئولی خـۆی و بـاقی ئـەسـحابە

---

[1] -لوح المحفوظ

نابێ بێ غەمبین لە غەمی عالەم
هەموو هەر براین بە دایە و بابە

خاوەن کشت و کاڵ ئاگر بڕ ئەکا
لەو رۆژا ئاگر بە جوش و تابە
ئاگر کەوتەوە بە سۆزەی بایێ
دنیا ئەسوتی و ژیان نایابە

دراوسێی بەدخوو تۆ بەدخوو ئەکا
ژن و کور و کچ هەموو یەک بابە
گەلێ پیرۆز و خاوەن شەرەف بێ
لەسەر نیک و بەد زۆر سەرحیسابە

زانایێ بمرێ نەزانان مردوون
نەزان بە زانا خاوەن مەئابە
هەرزەکاری گەل بە بێ زانایی
ئەڵێ ( لیتنی کنت ترابا)

تا فرسەت ماوە سەعی بە سوودە
کە فرسەت رۆیی رۆژی عیقابە[1]

نافامی ئێمە واین لە سەرسەفەر
مانەوەی ئێمە وەهمی حیسابە
نە پیر نە جوان نە شا نە گەدا
نامێنێ، فەنای نەسسی کیتابە

[1] -وادیارە دەسخەتەکەی مامۆستا لێرەدا بەیتێکی کەم بێت.

ئـــەو کـــێوە بـــەرزە والـــە بـــەر چـــاوا
ئـەو سـارا بـەرقـی وێـنەی سـەرابـە
ئـــەو گوڵـــزارانە ئـــەنـــازن بـــە گـــوڵ
ئـــەڵـــێی بـــەهـــەشـــتی(نِعـم المآبـــە)

ئـــەو رۆژە کـــەوا هـــەڵ دێ لـــە ئاســـۆ
ئـــەو مانگـــە کـــەوا خـــاوەن مـــەهتابـــە
بـــە میلیـــار کـــەســـی کـــوژراوی بینـــی
ئەو بە حاڵی خـۆی گـەنجـە و شـەبابـە

ئینـسان تـا نـەگـا بـە ئـەمـری (واقـع)
نـەسـیحەت لا ئـــەو (بـئس العتـــاب)ە
چـۆن رزگـار ئـەبـێ لـە دنیـای عـەیـار
دڵ ریـــــشە دارە و دنیـــــا قولابـــــە

یەکێ کە تێی‌کەوت بـاش حاڵـی ئـەبـێ
واتـــەی (ناصـــحان فـــصلُ الخطـــاب)ە
خـــەیـــالاّتی پـــوچ جنۆکـــەی دڵـــن
یـادی زاتـی حـەق وێـنەی شـەهابـە

(بسم‌الله) فـەرمـوون روو لـە خـودا کـەن
تـــا بتـــان بـــەخـــشێ خـــودا (تـــوّاب)ە
سەد هەزار تاوان بە یەک تەوبـەی سـاغ
ئـــــەتوێـــــتەوە وێـــــنەی حوبابـــــە

بیـر بکـەنـەوە پـێش کـەوتـن لـە بیـر
بیـــر بـــوێ باشـــە رووی لـــە (صـــواب)ە

تـــاوان باعیـــسە بـــۆ تـــاوی ئـــاگر
یـــانێ ئـــەنجـــامی قـــار و عـــەزابـــە

(نـــامی) دڵـــسوزی بـــرا و عـــەشـــرەتـــە
ئـــەگـــەر لـــە پیـــرە و ئـــەگـــەر(شـــباب)ە
هیـــوای رزگـــاری گـــەلـــی خۆیـــەتـــی
کـــزەی دەروونـــی وێـــنەی کـــەبابـــە

## بەراستی ئەگەر

بـــەڕاســـتی ئـــەگـــەر تـــێ فکـــری تـــاوێ
ئـــەزانـــی خـــودا دەلیلـــی نـــاوێ
خـــوا(بـــدیهی)یـــە بـــەبـــێ ئیـــستیدلال
دەلیـــل ئـــەت باتـــە نـــاو گـــێژی ئـــاوێ

کام دەلیـــل هـــەیـــە بـــۆ بـــوونی هـــەتـــاو
رونـــاکتر لـــە خـــۆی تابـــێتە نـــاوێ
بـــە یاســـای عالـــەم بـــە وێـــنەی چـــرا
پـــەروەردگـــارت دێـــتە بـــەر چـــاوێ

نـــان بـــێ نانـــەوا، دۆ بـــەبـــێ دەوڵـــەت
نـــابێ لا عـــاقڵ پیـــر بـــێ یـــا لاوێ
بـــۆچی بـــێ ســـەبـــەب نانـــێکت نـــەدی
بـــێتە ســـەر ســـینی یـــا کاســـە ئـــاوێ

واتـــە بـــە کـــورتی زوو جـــێگە ئـــەگـــرێ
لـــە نـــاو دەروون و پـــەڕەی هـــەنـــاوێ

قەت بە فەلسەفە مەڕۆن بۆ خودا
ناسینی خودا فەلسەفەی ناوێ

جۆشی سەرچاوان خۆشی سەرکاوان
خرۆشی لاوان کەبێنە ناوێ
هەموو بەجارێ بانگ ئەکەن لە دڵ
(لاحولَ و لا) بخوێنە تاوێ

ئەستێرەی پەخشان رۆژی درەخشان
ڕوخساری نەخشین کەژاڵی چاوێ
لەسەر دەس کار و سەنعەتی خودا
ئەبن بە دەلیل بڕوانی تاوێ

گوڵ و گوڵزار و پەڕە و گەڵای دار
خەمی لاو لاوان بە کرژ و خاوێ
ئەڵێن (صانع)مان گەلێ لەتیفە
دیارە وێنەی شەوقی هەتاوێ

(نامی) بە ناوی پەروەردگاری
سەرف بو عومری بەوێنەی تاوێ
هیوای وەهایە ئەوکاتە ئەمرێ
بەهەشتی بەرزی بێتە بەرچاوێ

## پرسیارێکە

پرسیارێکە کرا لە زانا
زانای خەبەر دار لە ڕووی جیهانا

ئەم خەڵـکە هـەمـوو خـۆ موسـڵمانن
بــە یاســای زاهیــر خــاوەن ئیمــانن
ئــەزانــن ئیــسلام پێویــستی عیلمــە
پێویستی عـەقـڵ و ئـەخـلاق و حیلمـە
ئـەزانـن بـە بـێ عـیلم بـە ئـەحکـام
جـێ بـەجـێ نـابێ ئـادابی ئیــسلام
بـوچ ئـەوسـا بـەبـێ رەسـایی مـادە
خوێندنیان ئەکـرد بـە هـۆی سـەعـادە
ولآت بـە ولآت ئـەچـون بـۆ غوربـەت
بۆ کەسبی عیلمـی بـەرزی شـەریعـەت
لە مـەشـریقەوە تـا مـەغریـب زەمـین
سەفەریان ئەکـرد لـە بـۆ عیلمـی دیـن
ئیــستە بــۆچ وەهــا لایــان دا لــە رێ
دەرزی دیــن نـەمـا لـە شـار و لـە دێ
یەکێ بانـگ بکـەی بـە کرێـی بگـری
دەرزێ ناخوێـنێ هـەتـاکـو ئـەمـری
ئەر ئەوسا کـەم بـوو پـارە و ئـاوو نـان
خــۆراکی هــاوین پۆشــاکی زســتان
ئێستە خۆ ئەسباب هەیە بـەقـەی حـاڵ
کەم کەس ئەبینـی(مفلـس) و بـی مـاڵ
بۆ کـەس ناپرسـێ لـە (علـوم)ی دیـن
بــۆچی ناترســن لــە خــودای (مبــین)
زانــا کــە بیــستی پرســی پرســیار
هـەنـاسـەیـیکی هـەڵکێـشا بـە قـار

فەرمووی وەڵامت کورت و موختەسەر
نەماوە نووری دەروونی بەشەر
دڵ نووری نەما چاوی کوێر ئەبێ
دڵی کوێر چلۆن توشی خێر ئەبێ
سا مەگەر کەسێ بێ دەستی بگرێ
لە چای تاریکا نەیەڵێ بمرێ
ئەوسا نووری دڵ ئەدرەو شایەوە
دڵ بە باسی دین ئەگەشایەوە
ئیمانیان وابوو بە خودا و ڕەسول
هەر دین کلیلە بۆ دەرگای (وصول)
هەرکەسێ دەرزێ بۆ دین بخوێنێ
جیهادی ئەکبەر بە حەق ئەنوێنێ
وایان دائەنا میدادی عالم
بەرزە لە خوێنی شەهیدی سالم
واقیعەن غەزا بۆ نەشری دینە
نەسرەتی خودا و یاسای ئاینە
پاش غەزا ئەگەر نەبێ عیلمێ وا
دین خزمەت بکا بۆ (قضا) و (فتوی)
سودێ نامێنێ بۆ جەنگ و جیهاد
غەیری بڕینی گەردنی عیباد
بەم مەعنا جیهاد بۆ موجاهدین
وەک ئیجتیهادە بۆ موجتەهیدین
ئەویان لائەبا کافر لە جیهان
ئەمیان دەر ئەخا ئەحکامی قورئان

ئـەویـان ئیفتیخـار ئـەدا بـە ئیـسلام
ئـەمیـان ئینتیـشار ئـەدا بـە ئـەحکـام
ئێـستە ئـەو باسـە قـەتعـەن نـەمـاوە
چـون دنیـا ڕیـشەی دینـی کێـشاوە
ئێـستە کومـەڵـی ئینـسانی دنیـا[1]
نـەک بـێ هۆشـەکـان ئینـسانی وریـا
پـەردەی تـاریکی وا لـە سـەر چـاوی
نەک هەر چاوی سەر چـاوەکـەی نـاوی
نرخـی دیانـەت نـەمـاوە لـەلای
قیمـەت دانـانێ بـۆ ئینـشا و ئـیملای
بە خـەیاڵـی خـۆی واپـێش ئـەکـەوێ
چـاوی بـە پـەڕەی قورئـان نـەکـەوێ
حەز ئـەکـەن بگـەن بـە پایـەی کـافر
تـەقلیـدیـان بکـەن بـاتین و زاهیـر
خولاسە ئەو سـا دڵ خـاوەن نـوور بـوو
بە کەسبی عیلمی دینـی مـەسرور بـوو
ئێـستە گـۆڕاوە یاسـای سـەعـادە
پیـرۆزی بـەشـەر بـووە بـە مـادە
نـازانێ مـاددە بـە مـەعنـا مـێیـە
بێ نێری (غیّـور) بـێ ڕێـگە و جـێیـە
نـوورەکـەی ئـەوسـا گـوڕاوە بـە نـار
ئەبـراری ئـەوسـا بـوون بـە ئـەشـرار

---

[1] پیاوی دنیایی

لە نار و ئـەشـرار چـی پـەیـدا ئـەبـێ
فیتنــە و فــەســاد و کیبریــا نــەبــێ
شەڕ نـابێ بـە خـێر تـا ئـاخـر زەمـان
ئـەشـراریش نـابن بـە مایـەی ئامـان
ئـەمـەیـە جـواب بـە شـێوەی راسـی
ئە گەر یاسای حەق بە حـەق ئـەناسـی
(نــامی) قانیعــە بــە واتــەی زانــا
چـار نییـە مـەگـەر خـودای تـەوانـا

## تێگەیشتن لە یاسای ژیان

دەخیل سەد دەخیـل بـاش ئـاگـاداربن
لە وەزعـی عالـەم زۆر خـەبـەر دار بـن
هـەتـا تـێ نـەگـەی(سـِـرّ)ی عائیلـە
تـێ ناگـەی نوختــەی ڕەشــی غائیلـە
ئەنا تـوش ئـەبـی بـە رووداوی تـوش
ئەگەر ئاسن بـی زوو ئـەبـی بـە پـوش
ئەوەی تێی ئـەگـەی بـە پایـەی پـەنـا
لـە بـۆ تـۆ ئـەبـێ بـە مایـەی فـەنـا
ئــەو ماڵــە لای تــۆ کــۆڕی کــەماڵــە
کولانــە کــۆنی توتکــەی گــەماڵــە
ئـەو کـەسـە لاتـۆ خـاتری جـەمعـە
داری کرمۆڵــی دەموکــەی(دمعــە)
ئــەو دارە لا تــۆ خــاوەن ســەمــەرە
ســەمــەری بــۆ تــۆ مایــەی زەرەرە

ئــەو خانــە دانــە لاتــۆ بــە فــەڕە
ژێــر خــانی جــێگەی ئاشــوب و گــەڕە
خــەرمــانێ لاتــۆ مــەڵــبەنــدی بــارە
زۆربــەی مــەڵــبەنــدی دڕنــدە و مــارە
ئــەو لۆقــەنتــەیــە جــێگەی پــلاوە
کاســە و کــەوچکــی پیــسە و گــلاوە
(الحاصل) نابێ بــەشــەر غــەشــیم[١] بــێ
بێ هۆش و گۆش و سادە و سەقیم بــێ
هــەر مولاقــاتێ کــە بــۆ بــە قــابێ
لــەویــا فکــری تــۆ بــە(ارتقــا)بــێ
بەڵێ بــۆ مــاوەی ساتــێک و دوو ســات
هەرچۆن بێ ئەڕوا لە ڕوی ســەربیــسات
سەبر و تــامڵ و تــەحقیــق و تــەفتــیش
ئینسان دەر ئەکا لە دەردی تــەشــویش
عــــاقڵ ئــــەزانــــێ خــــودا (واحــــد)ە
چــــونکی ئاســــار و کــــاری شــــاهیدە
بۆ مــەبــەستی بــەرز راویــژی بــەڕێــز
رزگارت ئەکــا لــە پــەرچــی و پــەرویــز
(نــامی) ئــەوەنــدە بــەراوردی کــرد
لــە دنیــا گــەیــشت بــە موتــالای ورد
ئــەم واتــەی منــە بــەکــەم مــەزانــن
هۆشــیار بــن بــە دڵ هــەتــا ئــەتــوانن

---

[١] - لە کار نەزان

## خۆشەویستی گەل و نیشتمان

خزم و بـرا و دۆسـت لـەگـەل نیـشتمان
وەفـا لـەگـەلیـان وا لـە گـەل ئیمـان
ئـەو خـاک و خولـە تیایـا ژیـاوین
وەفایـان فـەرزە هـەتـاکو مـاوین
عەرزی سەربـەرزی رووی هانـە بـەیـان
دەشتی بەهـەشـتت لـێ ئـەکـا عـەیـان
لـە بـەهارانـا بـێنی گولـزاری
شـیفایە لـە بـۆ جـەفـای بیمـاری
کـانی گوێـزان وکونـە مـشکاوی
میـشک و عـەنبـەرە رژایـە نـاوی
سەرکەوە لـە بـۆ سـەرگـەلـی گوێـزان
بڕوانـە دیـارن موشـتەری و میـزان
داپـەڕی لـە بـۆ کـانی مـاز و دار
بێن بکە هـەزبـێی بـێن خۆشـی بـەهـار
بـێرە خـوارەوە لـە بـۆ دەوری دێ
بـێنی گولـزاری بـەهـەشـتی لـێ دێ
بـاخ و بێـستانی دڵـبەری عـەرزە
یادیـان لـەسـەر دڵ بـە راسـتی فـەرزە
مزگـەوتـی بـەرزی شـیرین ئاسـاری
مایـەی سوپاسـە بـۆ خـودای بـاری
حوجرەی مەدرەسە و تـەڵـەبـەی نـاوی
بـۆ ئینـسان بیـری نـوورە بـۆ چـاوی

(بيتُ المعمور) بوون بۆ فریشتەی عەرز
بۆ فەقێی ساغی زیرەکی سەر بەرز
شیوی مەلەکی تا پیر سولەیمان
سەیرانگامان بون سەرتا بە دامان
دیوی ئەو دیوی چالە سووتاوە
بەهەشتی عەرزە و ناوی بەد ناوە
ئەگەر داپەڕی بۆ (کۆیک ئاوا)
لایقە بۆ شا بیکا بە ماوا
تایبەتی(زیویە) و قولە و سەر یالی
سەیران گامان بو کاتی منالی
هاژەی (گردەلان) کە ئەهاتەخوار
پێی سەرخۆش ئەبوو ئینسانی هۆشیار
ئەو بەرو ئەم بەر جێی دلداران بوو
جێگەی هەلپەرکێی پۆلی یاران بوو
بێرە سەر سەیری کێوی قارەوا
جێگەی سەیاد بو لە کاتی ڕاوا
دەشتی (بێل بڕۆ)(گۆمی سەی حەسەن)
پێی بلێی حەسەن من ئەلێم ئەحسەن
کاتێ دڵ لێتان بیر ئەکاتەوە
بەلای دنیادا لاناکاتەوە
ڕۆژی پیرۆزی ڕابردووی عومرم
وا لە یادما تا ڕۆژێ ئەمرم

(نـــامی) هـــەر مـــشتێ خاشـــاكی مـــاوە
ئـــەویـــش بـــە ئـــاری[١] دووری ســـوتاوە

## خودای نیگابان

خـــــودای نیگابـــــان خـــــودای نیگابـــــان
پـــەروەوەردەگـــاری پـــاكی میهـــرەبـــان
لـــە ســـەر ئاغـــازی دەســـتووری عـــەزیـــم
ئیختیـــارت كـــرد رەحمـــان و رەحـــیم
مـــەعنـــای ئـــەوەیـــە كـــە تـــۆ رەحیمـــی
خـــاوەنـــی خـــەیـــر و فـــەزڵـــی عـــەزیمـــی
ڕەحمـــەتـــت ئـــەونـــە پـــانو گوشـــادە
عاســـی بـــەو رەحمـــە دەروونـــی شـــادە
ســـابیكەی بـــەحـــەق ســـیفاتی زاتـــت
بـــەفـــەیـــزی عـــامی ڕووی ســـەماواتـــت
بـــەو بارانانـــە لـــە ســـەر ئـــێتە خـــوار
بـــە ئایـــات وەحـــی رەهبـــەری موختـــار
بە (سڕ)ی ئەسرارئەسمای حوسنای خۆت
بـــەو لوتفـــە عامـــە داد نـــاوە لـــە بـــۆت
بـــە (ســـڕ)ی جیلـــوەی ســـیفاتی زاتـــت
بـــە خـــێری عـــامی رووی ســـەر بیـــساتت
بـــە (ســـڕ)ی حـــوببی موخلیـــسانی پـــاك
عیبـــادەت كـــاری زاتـــی تـــەنیـــای تـــاك

---

[١] - سوكەڵە ناوی ئاگرە.

بــە ئیجابــەی خــۆت لــە بــۆ داعیــان
بــە (طـائف)ان و زومـرەی (سـاعی)یـان
بــــە ســـــاجیدانی ســــاحەی کیبریــــا
بــــە عــــــابیدانی بـــێ رەیـــب و ریــا
بـــە خاشـــیعانی خـــۆفی قـــەهھاریـــت
بە (طامع)انی جیلـوەی ســـــــەتتاریـت
بـــە فیـــداکاران بـــە روح و بـــە مـــاڵ
بە نەفس و نەفیس بۆ بە هـرەی کـەمـاڵ
بـــە فانییـــانی جـــــــەلالـــی زاتـــت
بـــە عـــــــاریفانی جیلــوەی ســیفاتت
بــە موســتەغریقــان لــە نــووری زاتــا
(متفرّغـــان) لـــــە ســــــەر بیـــساتــا
بـە وانـەی ئـەونـە ئـەهلـی تـەمکیـنن
غــەیـری جیلــوەی تــۆ شــتێ نــابینن
بــە قــوڕڕای قورئــان بــە نووســەرانــی
بـــە حــــافیزان و موفـــەســـسیرانـــی
بـــە (مُـــدَوِّن)ان بـــۆ ســـوننەی رهبـــەر
بـــە حــــــافیزانی ئــاینی ئـــەنـــوەر
بــە غـازی‌یـانی مـەعـرەکـەی کوففـار
فیــــــداکارانی رەهبـــــەری نــــــازار
بـــە شـــەهیـــدانی مـــەیـــدانی قیتـــاڵ
بۆ ئەعلا و بـە قـای دینـی (ذی الجـلال)
بــە خوێــنی ســافی جــەرگـەی شـوهەدا
لــە هــەر دوو دنیــا بــە حــەق ســوعەدا

بـــە عالیمـــانی علـــومی ئیـــسلام
زەحمەت کێشەکان بـۆ فـامی ئـەحکـام
بــە مــودەڕڕیــسان لــە ڕێــی خــودادا
هــەم بــە داریــسان[١] لــە رووی دنیــادا
بە ئەهلی تەئلیـف بـۆ بـە قـای ئیـسلام
بە ئەهلی تەکلیف بۆ نـەشـری ئـەحکـام
بــە مورشـیدانی ئـەسـحابی تـەکمیـل
بـــە موریـــدانی تـــالیبی (تحـــصیل)
بـــــە عـــادلانی چـــەرخـــی رۆزگـــار
بـــە عـــــامیلانی پـــاکی بـــــەختیـــار
بـــە واعیزانـــی ئوممـــەتـــی رەهبـــــەر
ئـامیر بـە مـەعـروف نـاهی لـە مونکـەر
بـــە موسـلیحانی (ذات‌البـین)ی نـــاس
بـــە ناسـیحانی دافیـع بـــۆ وەسـواس
بـــە کۆمـــەک کـــاران لـــە بـــۆ دامـــاوان
بــە مـاڵ و بــە حــاڵ بـۆ لـێقەومـاوان
بە دەس بـاردەران بـۆ بارکـەوتـووی رێ
بە دەس گیرانی کـەوتـوو لـە سـەرجێ
بە سرپۆشەکـــان لـە بـۆ لـێقـەومـاو
نایەڵن عـــەیبی بکـــەوێـتە نـــاو
کاتێ کە عەیبێ لە کـەسـێ هـەڵـکەوت
نایکەن بـە زیکـر و تـەلیلـەی مزگـەوت

---

[١] - دەرس خوێنان

بـــە تـێکۆشـەران بـۆ کـاری دامـاو
بـــە یارمەتـیدەر لـە بـۆ لـێ قـەومـاو
بـە چاوپۆشـەکـان لـە هـەرزە و نـەفـام
بـــۆ دەفعـی شـەڕ و ئاشـوبی ئـەییـام
بـــەوانــەی کـەوا ساڵـــی گـــرانــــی
بـۆ دامـاو ئـەبـن بـە هـۆی هـەرزانـی
بـە عــــەفوکـاران لـــە تـاوان بـاران
بۆیـان دێ رەحمـەت بـە وێـنەی بـاران
بە وانـەی نـەفـسی موشـتاق ئـەکـوژن
کەگۆشت و چێشتیان بۆ هـەڵ ئـەڕێـژن
بە وانـەی حاڵـی بـێ حـاڵ ئـــەپرسـن
لە بـەر رەزای حـەق لـە خـوا ئـەترسـن
ئەوانـەی فریـای نـەخـۆش ئـەکـەون
نایـەڵـێ یـەکجـار بـێهـۆش بکـەون
بـــەوانـە ئـەڕۆن بـۆدەوری مـــردوو
بە حاڵ یـا بـە مـاڵ بـەبـێ یـەک و دوو
بـــە وانـەی گیانیـان کـردوە بـە فـیدا
بۆخـێر گـەیانـدن بـــۆ رەزای خـــودا
بە وانـەی کـاتێ ئێحـسانێ هـەڵکەوت
ئـەبنـە پێـشەوا لـە مـاڵ لـە مزگـەوت
بەوانەی کەوا سـەرچـاوەن بـۆ کـەڵـک
بە مەرجێ دووربـن لـە ئـازاری خـەڵـک
ئامـــادەن لـەبـــۆ زۆری خـێر و فــــەڕ
حـــازرن لــە بـــۆ چـاری گـەڕ و شـەڕ

بـەو رەحمـە ئـەڕژێ بـە وێـنەی بـاران
بـۆ هـەمـوو عالـەم بـە ڕۆزگـــاران
نمێ یـا تکـێ لـە رەحمـەتـی خـــۆت
بـدە بـە ( نـامی) بـا خـادم بـێ بـۆت
باهـێزی بـبێ بـــۆ خزمـەت کـاری
باسـەر نـەنـێتۆ بـە تـاوان بـــاری
باسـەرفـەراز بـێ لـە کـاتی مـــردن
یەعنـی بـە بـەهـرەی ئیمـان دەر بـردن

## ئەزانن ئینسان بە چی ئەفەوتێ

ئەزانن ئینسان بـە چـی ئـەفـەوتـــێ
بـێ گـڕەی ئـاگر بـۆ خـۆی ئـەسوتـێ
بـە ناساغـــی لـەش بـە نائـەمینـــی
لـە غـەدری کـەسـێ پـێی دائـەمـێنـی
بـە کـەمـوو کـوڕی بۆمـاددەی ژیـــوار
نـەخـسوس قـەرزاری بـۆ پیـاوی نابـار
بـــە مـەرگـی ڕۆڵـە تایبـەتـی ناکـــام
نەخسوس بـە فیتنـەی نابـاری ئـەییـام
بـــە بـڵاو بـوونی کۆمـەڵـی یــــاران
بـــە وەیـــشومەی ڕەش لـــە ڕۆزگــاران
بـە تـەنیـا کـەوتـن لـە هـاتو چـــودا
یا هەستان لـەگـەل هاوڕێـی بـەدخـودا
بەمەرگـی گـەورەی خـاوەن یاسـای عـام
کە هۆی پیرۆزین بـۆ چـەرخـی ئـەییـام

بــــەدتــر لــە مانــە بــەدی دراوســـــێ
بــە بــێ ســەرئێــشە ســەرت ئــەماســێ
لــە مانــە بــەدتــر عـــــائیلەی خـــراپ
کە ئینسان ئەکەن بەسـیخی کـــەبـاب
نەخسوس بە ژنــی بــەد واتــەی بــەدڕوو
لە بەد بەدتریان بەد روو بــێ و بــەدخــوو
ئـــــەمانـــە هــەمــوو دژی حـــەیــاتن
شــاتری پـــۆستەی بــانگی وەفــــاتن
سا خــودا تــۆ بــی بــە لوتــف و ڕەئفــەت
بــارێ مــەنــێرە دەرچــێ لـــە تاقــــەت
تاقــەتــی ئــێمە گــەلــێ مـــــەحــدوودە
بــەدەردی نابــار بـــــوونی نابـــــوودە
(نــامی )لــە خـــــودا ئــەپـــاڕێتەوە
بــە بـــــاری نابــار نـــــەتلــێتەوە
بــە فــەیــزی ئــەوەی بیعــسەتــی عامــە
دینــی بـــەڕێــزی دینــی ئیــسلامـــە

**ئەوەی نافامێ باش نییە بدوێ**

ئـــە وەی نافــامێ بــاش نییــە بـــــدوێ
نــانی خــــۆی بخــوا و لــە جــێدا بنــوێ
بابـــدوێ کــەســێ زانــابێ بــەحــــەق
لــێک بـــــداتەوە نیــک و بــەد موتــڵەق
(استــعراض) بکــا تــاریخی ئـــــەییـام
لـــە ســەدری ئیسلام تا ئەمڕۆ بــەعــام

سوپای ئیسلامی کەهات بەسەردا
نوور لە ناو دڵو قورئان لە بەردا
خوا نەسرەتی‌دان بۆ فەتحی وڵات
لە ڕۆم لە عەجەم لە شار لە دێهات
ئینجا وڵاتیان دا بە دەس( حُکّام)
بۆ ڕاگرتنی نیزامی ئیسلام
کە دەورێ ڕابورد دنیا ئەگۆڕێ
چون چەرخی زەمان چەرخە و ئەسوڕێ
تەماعی دنیا کەوتە دنیاوە
سەرۆکی و شاهی بنێرە لاوە
هەزاران هەزار فێڵ و فەڕ داهات
ئەم دنیایە کرد بە شەوی زوڵمات
ئەگەر موجتەهید نەبێ لە دنیا
مەخلوقات نەبا بە ڕێی ئایینا
ئەهلی بیدعەت دێن بە وێنەی جەردە
دین تالان ئەکەن بە بگرە و بەردە
فەرزە ( أشعری) و ( شیخ ابومنصور)
بۆ زەبتی دین و عەقیدەی ئەستوور
بۆ ناعیلاجی ئیزهاری ئەحکام
فەرزە موجتەهید بۆ گەلی ئیسلام
تا ئەحکام دەرکا لە مەعنای ئایەت
لە بۆ یارمەتی چرای هیدایەت
(ابوحنیفە) و (مالک) ی شەریف
(شافعی) و (احمد) بە یاسای زەریف

فــەرزە دەربخــەن ئــەحكــامی فــەرعــی
هـــــە تا موسوڵمان وەرگریٚ شــــەرعــی
هەركەس جەسـور بــێ لــە روی ئــەمانــە
دووره له هـــــــــەرچی دین و ئیمــــانه
كـە هـەوەس بـازی كـەوتـە رووی دنیـا
شـــــەپۆلی دەرچــو بــە ویٚــنەی دەریـــا
فـــــەرزە وجوودی ئـەولیـای ئـەمجـاد
لـــــــە بــۆ ئیرشــادی عوقــەلای عیبــاد
رەشە عەوامی بــێ عــــــەقــڵ و كــەمــاڵ
چۆن ئێته سەر رێ بێ جەزبە و ئـەحـواڵ
چلون مـل نـەدا بـۆ یاسـای ئــــیـسلام
به خامی دەروون بــێ فـامی كـــــــەلام
شەرته لە بۆ دیـن بـە فرمێـسكی سـوور
واروی بـــــسوتێ دەركـــــەوێ لـــــە دوور
دەی هەركەس دژبـێ لـە گـەل ئـەولیـا
حــــــەقــە بـسوتێ لــە گـەل ئـەشـقیا
(والحـــاصل)دنیـــا هــــەزاران جـــۆره
ســــــەوزه و سـپی یـه بـەلـەك و بـۆره
بـۆ هـەمـوو بـارێ چارێـكی ئـــــەوێ
نـــــــە كـا موسوڵـمان بـاری بكـەوێ
راســته كـه یاسـای ئیـسلام كـــــافییه
بـــــە شەرتی نیـزام حــــەقـەو وافییـه
بـەلاّم پـێم بـڵێ لـە كـــــام زەمــــانا
خـــادمــی مـوخلیس هـات بـە جیهانـا

لە هەر چەرخێکا دەرکەوت (بصیص)ێ[1]
زوو کوژایەوە بە لێوی پیسێ
لە هەر دیوانێ چرا هەڵ گرسا
بۆ ئەوە خەڵکی نەمرن لە برسا
ناکاو رەشەبای مەینەت هەڵی کرد
دیوان و چرای بە جارێ لابرد
سەد هەزار قورئان بە بێ مامۆستا
کێ بوو فێری بوو ئێستە یا ئەوسا
ئەگەر مەلا و شێخ لە رێگە لادەن
فەرزە بە دوو دەس گوێچکەیان بادەن
مەبەس ئەمەیە ئێمە بەد بەختین
گیرۆدەی چەرخی تاریکی سەختین
بە بێ ئەم جۆرە ئێمە نەتوانین
پایەدار نابێ ئەحکامی ئایین
(نامی) مەبەستی ئەوەیە دنیا
کەس لێی تێناگا سا مەگەر وریا
شوعوری ئەوێ کاری دنیا و دین
فحسبنا الله و نِعْمَ المُعین

## ئەوەی مەحەککە بۆ ناسینی خەڵک

ئەڵێن جیوار و سوحبەت و سەفەر
سەنگی مەحەککن بۆحاڵی بەشەر

---

[1] - بریسکە، رۆشنایی

من ئەڵـێم کـاتی نـەهـاتی و نـوقـسان
فریادڕەسـی‌یـە مـەحـەکـی ئینـسان
تـا ئیحتیاجـت نـــەکـــەوێـتە لای
نـازانی ئـەشـێ لـە بـۆ یـا (مـــولای)
بـەڵا مـەحـەککـە ئـەگـەر تـۆ وریـای
بـۆ حاڵـی بـەشـەر ئـەمَلا یـا ئـەولای
زوروفـی زەمـان بۆتـەی بـــەشـــەرە
زێـــڕە یــا زیـــوە یــا بـــەد عونـــسورە
هاوارت بـۆ بـــرد تـێ ئـەگـەی حاڵـی
تێ ئەگەی پایـەی نـەقـس و کـەماڵـی
چەن کەسـی وا هـەن لای تـۆ وەلـی‌یـە
حاڵـی لـەو ڕۆژا لای تـۆ جـەلـی‌یـە
کە دەستێ ڕێـکەوت ئـەزانـی بـەحـەق
خودا پـەرسـتە یـا نـەفـسی ئـەحمـەق
جـارێ عابـدە و ئـــەهلـی عیبـادەت
خەڵکی ئەچنـە لای لـە بـۆ سـەعـادەت
کە هەل بۆی‌هەڵکەوت بەحەق تێ‌ئەگەی
عیبـادەتـەکـەی عـادەت بـو عـادەت
مـەبـە ستم لـێرا (سـوء ظـن) نیـیـــە
(سـوء ظـن) عـەیبـە و خـولقی دەنییـە
مە بـەسـت ئـەوەیـە بـاش ئاگـادار بـە
بازێ مـــــەزاهیـر ئـەهریمـەنـی‌یـە
گەلێ لـە ئـەحـواڵ حـــاڵی وەختـی‌یـە
تابیع بوون بـەوە هـەر بـەد بـەختـی‌یـە

بــێ نیزامــی دیــن حـــەق رانـــاگیرێ
بەشی خـانووی چـۆڵ هـەر نـاپوختیـیـە
( نـامی ) حاڵـی بـو ئاغـاز و ئـەنجـام
مایـــەی سـەعـادەت یاسـایە و نیـزام
اذا حکمــــتم بــین النـــاس ان
تحکمــوا بالحــــــق فــنعم المــرام

## لۆغەت گەلێکی ئەوێ

لۆغەت گەلێکی ئـــــەوێ بـــە غیـرەت
بە عیلم و عەمەل بە سەبـــر و سـیرەت
لە بۆهەر قۆڵـێ چەن کەس ئـــەهلی جـێ
بگــەڕێــن بـــە دڵ بــۆ شـــار و لادێ
بۆ خـێمە نـشین لـــە ڕووی ســـارادا
بـــۆ کۆســار نـشین لــە جـێ و ئـــارادا
بڕۆن بۆ بازاڕ بـڕۆن لــــە بــۆ دەشــت
لە هەموو شوێنێ بکەونـە سـەرگـەشــت
هەر شتـێکیان بیـست لــۆغەتـی سـادە
بـاش وەری بگـرن ئـــازا و ئـــامادە
بـە ڕیـزی حـروف گـردی کـــەنـەوە
نه و جار باش مەعنـای لـێک بـدە نـەوە
لە پـاش راگـرتن بـە یاســا و قـسمەت
تەرتیبـی بـدەن بـۆ فـامی ئــــوممەت
هـەتـا لوغـەت و لـەهجـەی هـەرچیـنێ
مەحفـوز بمـێنێ لــــە سـەر زەمینـــێ

ئەمەیش مەسرەف و فەڕاغی ئەوێ
دڵی گوشادی بێ داغی ئەوێ
مەسرەفی ئەوێ لە بۆ ئەم و ئەو
بۆ کەسبی لۆغەت لە کۆنە و لە نەو
جا چاپی ئەوێ بۆ نیگاداری
لە روی زەمانا بۆ یادگاری
(نامی ) وەهایە فکری لەم باسا
ئەمەیش موحتاجە بە هێزی یاسا
یاسایش خادمە بۆ بەزری ناو دڵ
عەرزێ بکێڵێ مومتاز بێ بە گوڵ
تا بیوەشێنێ دەستی خاوەن کار
بیشی پارێزێ لە خاشاک و خار
بە لام ئەو دڵە فەرزە کامڵ بێ
تابیعی فیعلی فەرزی حاسڵ بێ
ئینسان وا ئەبێ بە ئینسانی ساغ
ناساغ مەفروزە هەر بێ حاسڵ بێ
دین و ئاینمان کیتابە و سوننەت
لە گەل ئیجماعی عولەمای ئوممەت
ئیعتیبار هەیە لە بۆ( استدلال)
لە عولەمای بەرز (واصل) بە کەمال
یاسای دینمان دیارە رووناک
لای ئەهلی ئینساف خاوەن دڵی پاک
خوا فەرموویە خوای عالەمین
لَفظِی(لِسانِ عَرَبِی مُبِینْ)

لادان لە زاهیر لادانە لە حەق
قەبوڵی مەکەن لە ئەحەد موتڵەق
مەگەر دەلیلی قەتعی مانیع بێ
لەوەی زاهیری مەعنا واقیع بێ
(تأویل) لادانە لە بەر ناچاری
ئەبێ نەگاتە باری ناباری
ئەوەی لائەدا لەیاسای کیتاب
یەقین لای داوە لە ڕێگەی سەواب
ئەم هەموو بیر و باوڕە پووچە
هەمووی لە شومی فیکری پڕ سووچە
بیر بکەنەوە بۆ مێژوی ئەییام
لە چەرخی مولای (سید الأنام)
چلۆن ڕەفتاری ئەکرد بە قورئان
وا رەفتار بکەن تا ئاخر زەمان
ئەنا لابدەین لە بەر دیناری
باغ فروشتنە بە گڕەی ناری
قەت قابل نییە ئەفکاری عالەم
هەموو سەحیح بن راست و موسەللەم
بەعزێکی راستە و بازێ درۆیە
ئەم قسە ڕاستە و بێ گفت وگۆیە
ئەو راستە وەها ئە دۆزێتەوە
کەیاسای حەزرەت بکوڵێتەوە
قەت قابل نییە ڕێی لێ گوم بێ
ئەوەی یاسای شای لە لا گووم نەبێ

(نـامی) هـەر ئـەوەی ئـەوێ لـە خـوا
کە ون نـەکـا حـەق بـە سـەودای هـەوا

## یەکێ بانگی کرد

یە کێ بـانگی کـرد ئـەی بـەنـی ئـادەم
من حـاڵی بـووم لـە نـەخـشەی عالـەم
کـەچـی تـێ ناگـەم لـە خـەریتـەی ڕوو
لە نـەجزاکـانی نـــە ئیـستە نـە زوو
وتـم براکـە م گـوێ بگـرە لـــە مـن
بۆ ئەم مەبـەسـتەت ئـەبـــم بـە زامـن
بـە پـــانی بـەینـی دووگوێـچکەکانـە
بۆ تـــوول مووی سـەر و چـەناکـەتانـە
هـەرچـی لـەونـاوا هـەیـە رووخـسارە
دیارە لای کـەسـێ زانـا و هـــوشیارە
بژمـێرە لـە سـەر رووخـساری پاکـت
تەختـی تـــەوێـڵی جـوانی رووناکـــت
بـــەڵام مـەژمـێرە جوتـەـ(نَزْعتـان)
دوشاخەی سافی پـاک لـە مـــووەکـان
بژمـێرە لـە سـەر(تَخـذیف) لـە لاوە
لـەلای گوێـچکەکـان لـەم لاو لـەو لاوە
ئەشراف مـووەکـەی لائـەبـەن لـەسـەر
هـــەتـا روخـساریان بکـەوێـتە دەر
(عـذار) گێـسوە لـە سـەر دێـتە خـوار
ئینسان ئەپـێکێ بـە وێـنەی ڕەشمـار

بەڵام بۆ مـەحبـووب ـەردی دڵـدار
دە سـتەی ڕیحانــەن ڕێــحانی ئــاودار
(صُـدغ) لــە لایـان تـا ئـەترافـی چـاو
پاک و ڕووناکن بـە وێـنەی هــــەتـاو
هــەروا ئـەو گوڵــە لـە پاڵــی گــــوێدا
ئەلـێی فریـشتە پـێی نـــــــاوە پـێیدا
(عــارِض) یــانی ڕوو کوڵـــمی ئینـسانە
نیـشانەی بــەرزی و بـارە و ئیحـسانـــە
(شــارِب) سمێــڵە لــە هــــەردوو لاوە
(حاجِــب) برۆیــە جـێی لـە سـەر چـاوە
(زَقَــن) چــــەناکــە ســوونعی خودایــە
بەندی شـەویلـەی ئــەملا و ئــەولایـە
(عَنفقــە) چاڵـــی بــەرلــێوی خـــواروو
بـۆ ئـازاری دڵ ئـەبــــێ بـــــە داروو
(مُوق)گۆشەی چاوێ ئەڕوانــێ بــۆ لــووت
(لِحاظ) لـەم لایـە بیزانـە مــــەزبـووت
هەم لەرووخسارە«نەرمـەی»بـەری لـووت
فـەرزە شـۆرینی بـە یاسـای مـەزبـووت
هـەر موویـە هـەیـە لـە نـاو رووخـسارا
شــۆرینی فــەرزە لــە لای هـــــۆشیارا
بەڵام مـووی ریـشت کـاتێ کـەپـڕ بـێ
فەرزە بـە تـەنیـا زاهیـری تــــــەڕ بـێ

( نامی ) ئەم باسەی کرد بە یادگار
بۆ برایانی پاکی تاعەتکار

**بێ خواستی خوا هیچ شتێ نابێ**

ئەڵێن وڵات و زەمانەی ژیوار
تەئسیریان هەیە لە بۆ بەختیار
ڕاستە ئەم واتە بەڵام حەقیقەت
وا لە سەر خواستی (خالقی مختار)
بەخت و تالیع و بەرزی و نزمی تۆ
پایە و مایەیێ وارد بن بۆ تۆ
فەرعن بۆ جیلوەی تەجەللای باری
کاتێ بییەوێ بارەبن بۆ تۆ
کاتێ کە ویستی لوتفی بێتە کار
لە دێی ویرانە ئەتهێنێ بۆ شار
ئەت کا بەدارای ئەدەب و ئەخلاق
ئەتکا بەگەورە و سەرۆکی موختار
عەمارەتێ خۆش ناوودەر ڕوونـاک
بەرماڵێکی پان چەن دراوسێی چاک
ژین و ژیواری بێ دەرد و ئازار
ڕێک ئەخا بۆ تۆ بە هەزار هەزار
ئەگەر دژمنێ دەس ببا بۆ تۆ
زوو چاری ئەکا لە دەر بێ یا کۆ
کاتێکیش ویستی وەرگەڕێتەوە
جیلوەی ئیحسانی ئەشارێتەوە

سەد چرا هەڵکەی واسەرکوێر ئەبی
ڕێگەی پانی خۆت نادۆزیتەوە
جاهەر مەشورەت ببن بۆ خودا
بەکزەی دەروون، بێ هەرا و سەدا
بڵێ ئەی خودای سەراسەر جیهان
ئەی نیگابانی دیاری و پەنهان
جلوەی ئیحسانت با بەردەوام بێ
ڕەسای ئەوزاعی چەرخی ئەییام بێ
یارمەتی بدە خاوەن وەفا بین
نەک موستەحەقی ماری جەفا بین
بە میهرەبانی بە فەیزی ڕەحمەت
دوور بین لە باری خاریج لە تاقەت
بمان کە بە دۆس بۆ دۆستانت
بۆ خاوەن سیدق و وەفا و ئیمانت
مەمان دە دەستی نەفسی ئەممارە
یا ستەم کاری لە حەق ئاوارە
مەم دەرە دەستی نەفسی پەستیخۆم
بەد حاڵی مەکە بە مەبەستی بۆم
چەن ڕۆژێ ئەژیم بژیم بەخۆشی
سابت بم لەسەر عەهدی قودسی خۆم
(نامی) پەروەردەی باغی ئیحسانە
لاتۆ (زید) و (عمرو) هەموو یەکسانە

دەریای ئیحسانت کـە کـەوتـە شـەپـۆل
چی بـەرزی و نزمـی بـە یــەک میزانـە

**مەشیخەت دوورە لە جۆشی هەوا**

مەشیخەت دوورە لـە جۆشـی هــــەوا
لە فــــڕ و فیـز و خـــــرۆشـــــو داوا
دوکتور بە زمان نـابێ بـە تـــــەبیـب
بێ سودی دەرمان نابێ بە حـــــەبیـب
هەزار قیـل و قـال نـابێ بـە نانـــــێ
بـــە حورمەت دایئنێی لە بـــۆ میـوانێ
شەریعەت خـوانی پـڕ نـان و ئـــاوە
نانیش بە بـێئـاو هـەر ناتـــــــەواوە
(تصوف) مـــەعنـای ئیخلاسـە بـــەدڵ
هـــەتا کردەوەت بگـــاتە مـــەنـــزڵ
ئیخلاس چرایـە بـۆ شـەوی تاریـــک
ئیخلاس عاسایە بۆ شـێخ و بـــۆ شـیک
مـــسقاڵە زەڕڕە نییـــە لـــــە دینـا
بێ بە ســــەربـار بـە ســـەر ئایینـا
ئـــەهلـــی(تـــصوف)باوڕیـــان وابـــوو
کاریان بێ ئیخلاس هـــەر ناتـــەو بـوو
هاتن بە ئـیخلاس بـە یاسـای ڕەهبـەر
بەڵکو دەروونیان دەرچـێ لـە کـــەدەر
بە ئیتتیباع و پـــەیـڕەوی حـــەزرەت
عیبادەتیان کـرد بـە عـەینـی عیبـرەت

هـــــەتا بەفەیزی خودای عـــالەمـین
عـــــەلاقەدار بوون بەنووری ئـــەمـین
ئـــەوجار بەیاسای ئەسحابی (اخـلاص)
هــەرکەس بەجۆرێ کەوتــە (اختـصاص)
ئەوەی کە زیکری ئـەغـلەب جـەهریـە
شۆرەتــی دەرچــــــوو بــە (قـــادریە)
چونکە ئەو زیکرە بە شـێوەی (وافـــر)
یاسا بوو لـە بــــۆ شـێخ ( عبدالقـــادر)
ئەوەیش کە زیکری سیڕڕی و خەفی‌یـە
دەرچوو بــــە ناوی (نەقشبەندیـــــە)
چونکە (محەممەد شاهـــــی نەقشبەند)
بەو جۆرە زیکرە بـوو بـە ئـەرجومـەنـد
بەو زیکـرە نـەقـشی (الله) کـەوتـە دڵ
بەو چرا گەیشت بـە مـاواو مــــەنـزڵ
هـــەر وەها باقی تـەریقـەتــــەکـان
تـــەریقەی خاوەن حـــەقیقـەتـەکـان
و اتــــــــــقوا الله و یعلـــــــــمکم
عـــــام شامـــــل لنـــا و لــــــکم
بەم جـۆرە داهـات نـاوی تـەریقــــەت
بـە خزمەت کـاری لـە بـۆ شـەریعـەت
تـەریقـەت ئـەگـەر لــــە ئـایین لادا
کـوڕی مورتەددە ئیرسـی پــــێ نـادا
مەشیخە ت دارای چـەن عـەلامـەتــە
یـەکـەم نیـشانەی ئیـستیقامـەتـــە

لــە ســـــەر ئـادابی ســوننەت و کیتــاب
بە یاسای رەهبەر بە یاسای ئـەسـحاب
بـــە یاســای رەســای گـــرۆی تــابیعین
رضـــــی الله عنهــــــم اجـــــمعین
دووری لــە کــاری نابــاری بیدعـــــەت
دەوام لە سەر رێی جومعە و جەماعــەت
دووری لە حـەرام بــە هـــــەموو بــارێ
دووری لە فــــەحـش و کــاری نابــارێ
بـــەجــێ هــێنانی واجیبــاتی خــــۆی
ئــەونە مومکینە رێ ئــەکــــــەوێ بــۆی
بــەجــێ هــێنانی ســوننەتــی رەســــول
کە ئەبن بە هــۆی نــەجـاح و (وصــول)
نیــشانەی دووەم(شـــهود)ە و حـــوزوور
یانێ پــەیوەندی لە گەڵ ساحـێب نــوور
نیــشانەی ئــەمــە لـــەســەر رەفیـــقە
رەفێقیان دائیم روی لــــــە تـەوفیقـە
خاتریــان جــەمــە دڵــیان دامــــــەزراو
بەسەرچاوەی نوور سەر سەوزە و تـێراو
هەرکەسێ سوودی نەبــێ بـــۆ رەفـێق
ئـــــەوە بێ بەشە لــە بـارەی تـەوفـێق
نیشانە ی سـێهەم سـلوکە بــە حـــــەق
لــە لای مورشــیدی عــالمی مـــوتــڵەق
یانێ عـــــالم بــێ بــە زات و سـیفات
عالم بە ئـــەرکـان یــانێ واجبـــــات

عالم بێ بە دیـن بـە گوێـرەی تاقـەت
ئەوسا پێی ئەڵێن خـاوەن تـەریقـەت
بە نـــووری ئـەزکـار مونـەووەر بـووبێ
نـــەفـی و ئیـسباتی (مــصوّر) بـو بـێ
خاوەن بارە بـێ بـە فـــەنـا و بـــەقـا
بـە یاسـای عـورفی ئـــەربابـــی لیقـا
وا شەپۆل بدا لـە سینەیـا نـــــــوور
دڵی غافلان بـــکا بـــــە تـــــەنـــوور
خاشـاکی جـەفـای هـــەواو ئـــارەزوو
دەرکا لە دڵدا بـــــە حـەق زوو بـە زوو
سینەی مــــوریدان پـڕ بکـا لـــە نـوور
بیکا بە خـاوەن بـۆ مایـــــەی حـوزوور
هەرکەسـێ بـۆ ئـەو ببێ بـە مـــورید
بیکا بـە داری سـەمـەرەی تـــەوحیـد
ببێ بـە مایـەی سێبــەر و ســـەمـەر
ببێ بە مایەی پیـرۆزی بـــــەشــــــەر
ئـــەونـده دوور بـێ لـە هـەوای دنیـا
جێی شوبهە نەبێ بـۆ ژیـــــری وریـا
ئـاخر نیـشانەی رەحمــە و دڵـــسۆزی
بۆعالەم ببێ بـــە هـۆی پیــــــرۆزی
یـــانێ رەوشـــتی محـــەممـــەدی بـــێ
عیمادی پشتی کـۆی سـەمـــەدی بـێ

## پێوستە وریابین

بـە هــەوا نـابێ سـەفـای دینــداری
بـــە جـەفـا نـابێ خــزمەت گـوزاری
(مـشتبه) مـــەبـن وریـا بـن وریـــا
جادوگـــەرێـکە هـــەیـولای دنیـا
دنیــا ژنـــێکە زۆر چــاوی جوانــــە
کێ بێ دیـل نـەبـێ بـەو دوو چاوانـــە
دوو چاوی هەیـە یـەکـەمیـان مایـــە
چاوی دووهەمی بـــۆ شـانە و پایـــە
دنیــا داوێــکە دوو تـــــاڵ تنــراوە
تاڵێ دوو هــــەودای لـێک بـــادراوە
چـوار ژنـت بـبێ یـەکـی چـوار کـــوڕ
وێــنەی جـەواهیـر لـەمـەرجـان و (دڕ)
بەنیگـای چـاوی تـــەڵاقـی هـەمـــوو
واجـب ئـە کـابۆت فـەورەن زوو بـەزوو
چاوێـکی مـەیلـی بـەرزی پایـەیـــە
چاوێکی لـەیلـی مـاڵ و مـــایـــەیـە
پایە و مایەکـەش لـەسـەر هـەوایـــە
شەپـــۆلی هـەوا مـەرجـــی دە ریایـە
مەرد ئـەو مـــەردەیـە جـامی پـاکی دڵ
بـە ساغی ببـا و بگـــاتــە مــــەنـزڵ
(وَ نَهـــَـی النَّفسَ اَیْ عَنِ الهَـــوَی)
چوارتەکبیـرەی بـێ لـــەسـەر ماسـیوا

دنیـا هاتـە پـێش پـەردە ئـــەگـێڕێ
حـــەقیقەت لاتۆ بـە پـــووچ ئـەگـۆڕێ
هـەرگیـز نـەمـدیوە جادووگـــەرێ وا
تۆز بکا بـە ئـاو ئـاویش بـە هــــەوا
بەراورد کران ئـــەم پـەڕ تـا ئـەو پـەڕ
لە پیاوی پیادە و سـواری سـەر بـە فـەڕ
هەموو بـێ فـەڕ بـوون لـەدەور و بـەریـا
یانێ کونـدەبـو فـــڕی بـە ســــەریـا
سـاغ لـە دنیـادا یـەک لـــە میلیونـــە
ئەنا مەجنونە یـا خـــۆ مـەعیـونـــە
ئەگەرئەم گەلە هـەمـــوو سـاغ ئـەبـوو
ئەم دنیا یەک سەر وێنەی بـاغ ئـــەبـوو
ئـەم دڕکـو داڵـە وان لـــە بـەر چـاوا
خەوش و خاڵـێکن کـەوتـون لـە نـــاوا
دەم بـازی نییـــە حـەقیقـەت کـــاری
حـــەق هەر ئیخلاسـە بـۆ زاتـی بـــاری
(نـــامی ) لـــەوانـە زۆر شـــەرمـەسـاره
هیوای هەر عەفـوی خـــوای سـەتتـاره

## ئینسان بە وێنەی رزقی عەلوەیە

ئینسان بە وێنەی رزقـی عـــەلـوەیـە
بەرزی و نزمی ئـــەو لـە سـەر جیلـوەیـە
رۆژێ رژاوە بـــــە نـــاو مــــەیـدانا
رۆژێ شاراوە کـونجی خـــەڵـوەیــــە

راستەعەلاقەی کات و شوێنەوار
بۆ بەرزەوەبوون یا بۆ سەرەوخوار
بەڵام کەنەما جیلوەی کەرامەت
بێ سودە هەوڵی ئینسانی هۆشیار
ئەڵێن لە سەما وەزن نامێنێ
یاڕۆی بێ جیهاز دۆش دائەمێنێ
نە مومکین ئەبێ بڕوا بەرەو ژوور
نەبۆ بەرەوژێر هەنگاو هەڵ دێنێ
ئەم جیلوە فەرعە بۆ خواستی دادار
کاتێ کەویستی کەرەم دێتە کار
لە ئەشکەوتەوە ئەتهێنێ بۆ دێ
لە دێهاتەوە ئەتبا لە بۆ شار
عەمارەتی پاک ناو و دەر ڕووناک
بەرماڵی گوشاد چەن دراوسێی چاک
ژین وژیواری بێ دەرد و ئازار
ڕێک ئەخا بۆ تۆ بە وەزعێکی چاک
کاتێ کە ویستی وەرگەڕێتەوە
ئەو جیلوەی لوتفە ئەشارێتەوە
سەدچرا هەڵکەی واسەرکوێر ئەبی
لە کەندی مەهلەک ناگەڕێتەوە
جا هەر مەشوەرەت ببەن بۆ خودا
لە کزەی دەروون بە جۆش و سەدا
بڵێن ئەی خودای سەراسەرجیهان
ئەی نیگابانی ئاشکرا و پەنهان

مەمان دە دەستی نەفسی پەستی خۆ
وەن مەکە لێمان رێگەی قودسی خۆ
با ماوەی ژیان لەگەڵ ئیمان بێ
تاپاش نەکەوین لە مەبەستی خۆ
مەبەستم خودا هەر رەزای تۆیە
دڵم دڵبەندی رێی قەزای تۆیە
دڵمان پەروەردەی ئیحسانی تۆیە
ئەوئیحسانانەی شایانی تۆیە
ببەخشە پێمان حوسنی رەفاقەت
لەگەڵ ئیمان و سیدق و سەداقەت
بمان پارێزە بە میهرەبانی
لە شەڕی باری خارج لە تاقەت
(نامی )لەگەڵ جۆش جۆشی دەروونی
ئەپارێتەوە بەدڵ زەبوونی
هەرداوای فەیزی ئیحسانت ئەکەم
تا رێگە بگرم بە رانموونی

## چەند چوارینە

دراوسێ شەرتە بۆ خانوو کڕین
هاوڕێ وەربگرە بۆ رێگە بڕین
ژنی چاک شەرتە بۆ ژین و ژیوار
کەدەسمان نەکەوت یەخە دائەدڕین

لەگەڵ ناباراکارت نوقسانە
رەفیقی بەدخوو دوور لە ئیحسانە

بە تـــــاقە دەستێ چـەپـڵە نـاکوترێ
دوو دەستت هــەبوو چـــەپـڵە ئاسـانە

فەرمانی مەردی لـەسـەرتـەختـی عـەرز
رێ‌کەوت بەرێکەوت بـۆ گـەلـێکی بـەرز
قـــەت لـەدنیـادا نیـــعمەتـێ نـــیـە
چاتر بێ بۆ گەل لـە یـــەکیـەتـی تـەرز

لاتـی و نـەزانـی بـــــە وێـنەی خانـە
مەڵبەنـدە لـە بـۆ خوێـش و بـێـگانـــە
نـــەزان وەرئـەگـرێ بیـــــری نـاڕەوا
لاتـە نۆکـەری کـــوێخای کـەرانـــــە

ئەگـەر لات نـەبـی سـەرگـەردان نـابی
گیـرۆدەی دەسـتی نامـــەردان نابـــی
گـــەر نـەزان نـەبـی ناکـەویتـــــە داو
موبتەلای هـەوای ڕای شـــەیتـان نـابی

چـاری ئـەم دەردە زانـــستە و پیـــــشە
لە بۆ سەربەرزی ئەبـن بـــــە ڕیـــــشە
گەلـێ کـە زانـا و خـاوەن پیـشـــە بـێ
دوورە لەهەرچـی مـــەینـەتـو ئێـشـــــە

گەلێ کـە یاسـای تـەمـێ نــــەبیــــنێ
لـە خۆشـی دنیـای کـەمـێ ئـەبینـــێ
دڵـی بـێ تـەمـێ چـاوی مژمـــــــۆرە
لە باتی هـەدەف تـــــــەمێ ئـەبینێ

واتـــەی پێـــشینیان پێـــشەوای تۆیـــــە
لـە پـاش حـوکمی حـەق حـاکمی نۆیـە
(نـــامی) بـــە حـــوکمی شـــعوری ســـالم
ئەڵێ حوکمیحەق ڕێـیسـەفـای تۆیـە

## هەرکەس مارەی کرد

هەرکـەس مـارەی کـرد ئـەمدنیـا لـێوە
شەقـی تـێهـەڵـدا بـەڵام بــــە پـێوە
کەس حاڵی نـەبـوو لـەم موعـەممایـــە
دنیـا کـام جینـسە ئینـسە یـا دێـوە
ئەگـەر سـالیکێ هـەڵـکەوت بـە ڕێـوە
زوو خـۆی پـێگەیانـد دەسـتی داپـێوە
ئـەو دەس لـێدانە وەهـــا شـێتی کـرد
کـەس نـەیبینیـوە لـێوە بـــەو شـێوە
کاکڵەی ئەمـەیـش ئـــەوەیــــە ئـادەم
ئەوکاتەی دەرچـوو لـە پـەردەی عـەدەم
وەها تێئـەگـا هـەر تـــەنیـا بـۆ ئـــەو
دنیـا کــراوە بـەعـەرش و عـــــەلـەم
نازانێ چەنهـا لـەشـەخـسی شامـــەرد
چەن شێری شەرزە چەن مەردی نەبـەرد
زەحمـــەتیان کێـشا لـــەم دنیـــای دونـــا
عاقیبەت دەرچوون بە هەناسـەی سـەرد
بـــازاڕە دنیــــا کـــــــــارێزە بـــازار
ساتـێکی سـوودە و ساتـێکی خـەسـار

هەرکەس چەن ڕۆژێ وا لە مەیدانا
عاقیبەت ناچار ئەڕواتە کەنار
غایەی ئادەمیش پایە و مایەیە
هەوایە و هەوڵە بۆ ژین و ژیوار
نازانێ چاتر لەمانە هەمووی
ڕەوشتی باشە لە رووی ڕۆژگار
چاری ئەم دەردە ئەر راستت ئەوێ
بە کەم خواردنە هەتا کەم بنوێ
کەم خۆراکو خەو دڵی روناکە
ئەغلەب لەباسی ماریفەت ئەدوێ
(نامی) وەها بوو بەراوردی ئەو
لە چەرخی پێشوو لە رووداوی ئەو
ئینسانی بێ دڵ نازی بە شادی
دڵیش پێویستە بە نوور و پەرتەو

## هۆی رزگاری چییە؟

مەزهەری شەرەف لای گەلی ماددی
هەر ریش و پەشمە و ژیواری عادی
لە لای عاریفان شەڕەف تەقوایە
بە مەرجی عیلمی ئەسڵ و مەبادی

پیرۆزی ئوممەت لە رووی جیهانا
حەوت روکنی هەیە وای دانا زانا
بە بێ ئەوانە قەت قابل نییە
ئوممەت پێش کەوێ لە ڕێی ژیانا

عـیلم و سـەنعـەت و هـێزی بــەرگـری
مــاددەی ژیــوار و خــولقی رەهبــەری
ئەمانـەش بـبن بـە بـێ یــــەکیـەتـی
ئوممــەت ناگاتــە پایــەی ســـــەروەری

مـەزهـەری سیقەی ئینـسانـی عــادی
هەر ڕیش و پەشـمە و ئومـووری مـاددی
بــەلاّم لای عــاریف ریعایـــەی نیــزام
فــەرزە مـەقاسـید یـا لــە مـــەبـادی

پارێــزی منــالّ فــــــــەرزە و زەروری
لە هاوڕێی بـەدخـووی مـسافەی دووری
تـا دائـەمـەرزێ عـەقـلّ و شوعــووری
بــۆ ڕاگرتنــی نامــــوس و نـــووری

زینهـار دوور کـەون لـە هـەرزە کـــاری
لـە دەم بـەتالّــی لـە شــەرمـەساری
هەر ئەدەب ئینسان ئەبـا بـۆ حـەسـەب
دلّ و دەم پــاکی و خدمــەت گــوزاری

بەنەفس و بــەمـالّ بـــە پایـە و مایـە
بۆ هەموو کــــەسێ شـایا گـەدایــــە
نەخسوس بۆخـاوەن شـەرەف و تـەقـوا
بۆ لێ قـەومـاوی زوو خـــاوەن پایـــــە

(نامی) حالّی بـوو بـە عـــومری درێـژ
لە بەرزی و پەسـتی جـێی هـەوراز و لـێژ

حاڵی بوو تەنها خــزمەتی ساغـــە
مایەی رزگاری لەگەڵ دەست ئاوێژ

## قاوە قاو مەکەن

قاوە قاو مەکە ن هەرچاکە چاکە
تاڵ لە گەڵ شیرین باشە براکە
بەڵام هەر تاڵی بێ زۆری قەزا
نە لە بۆ دنیا نە بۆ دین چاکە

خودا پێداوان خودا پێداون
بە شەرەف ئەژین هەتاکو ماون
لە پاش مردنیش ناویان زیندووە
ئینسانی هۆشیار ناڵێ نەماون

ئەم بەهرە لە سەرئیفادەی عامە
تەنویرە و عیلمە و بەزلی تەعامە
موساعەدەیە لەبۆ داماوان
یەعنی مەنبەعی فەزڵ و ئینعامە

بەبە لەم بەشە خودا نەیبڕێ
بە هەموو دنیا کێ بێ بیکڕێ
ئەگەر ئادەمی بەم جۆرە بژی
دەقیقەی عومری ئەژی بە دوورِی

جا نەخوازە الله خاوەن دڵەکان
خاوەن حەدیقەی پڕ لەگوڵەکان

نیگـای چاوێـکیان حاڵـێ ئـەبـەخـشێ
نـای‌دەن بـە دنیـا خـاوەن دڵـەکـان

دنیـا بـــەوانـە چـاوی رووناکـــە
ئـەگـەرنـا وێـنەی کوێـری غـەمناکـە
هـەتـاو لـە چـەرخـا چـاوی کـەیوانـە
بـونی ئـەمانـەیـش دووچـاوی خاکـە

ئینـسانی بینـا ئـەبـێ بـــە دەلیـل
ئینـــسانی بـێ چـاو دامــاوە و زەلیـل
ئـەوانـە نـــەمـان لـە رووی جیهانـا
ئـادەمـی ئـەبنـە دامـاوی عـــەلیـل

(نـامی) خادمـە بـۆ ئـەو مـەردانـــە
قـسەیـان قووتـە بـۆ ئـەم جیهانـــە
خـودا نـەیبـڕێ وجـوودی مـەسـعوود
ئـەگـەر دیـارە و ئـەگـــەر پـەنهانـە

## ئەوزاعی دنیا

دنیا بـــە زۆرە بـە زێـڕ و بـــە زیـــو
بە دەستە و بەستە و ئەم دیو و ئـەودیو
بـێ زۆر بـێ زاتـە لـە مـاڵ دەر ناچـێ
نیسبەت بە عالەم نـە ناسـە و نـە دیـو

هەرکەس دەستی بو دەستی‌خۆی وەشان
چەن قات قەسری خۆی بردە کاکەشـان

نەمامی دانا و جۆگەی بۆ هەڵ کرد
وەردی خۆی بڕی و تووی خۆیی وەشان

ئاوی زۆرداران بەرەو ژوور ئەڕوا
ئاوی بێ زۆریش ئەڕوا بێ عەفوا[1]
دنیای دەوڵەمەن بەرێزە و ریزە
کاری بە گرەی کارەبا ئەروا

ئەم عەرزە بۆرە و ئاسمان شینە
عەرزە هەر عەرزە هیندە یا چینە
کابرای پیشەوەر وەک پیشە وایە
لە بەر پیشەکەی خاوەن تەمکینە

بەخودا بنازە و بە خۆتا نەک کەس
کەس بۆ کەس نابێ بە شان و بەدەس
قورئان بەرودوای بە بێ و بەسینە
یانێ دەستووری قورئانەکەت بەس

دوو عەقڵ هەیە بە سوودن بۆ ژین
یەک عەقڵی دنیا دووهەم عەقڵی دین
هەرکامت نەبوو کۆڵەوار ئەبی
لێت تاریک ئەبێ هەتاوی نوورین

گەلی ئەنانی و بێ عەقڵ و نەزان
هەتا هەتایە قەت ناگا بە شان

---

[1] - بێقیمەت، بەهەدەر

تــا نــانی هـــەبــێ لــــــە دۆژە دووره
کاتێ دۆی هەبــوو بــێ بــەشــە لـه نـان

عالەم شەخسێکە پــێی ئــەڵــێن گیتــی
عــیلم دڵــیەتــی و رۆحــی یــەکیــەتــی
(نــامی ) لــه عـــــومرا بــەراوردی کــرد
گەل بێ یەکیەتی بە حــەق پــەکیــەتــی

ژیـــانی دنیــا لـــه بــــــۆ بـــێ نـــاوه
ئــەگــەر نــاودار بــوو بـــــه هــێز و تــاوه
نـــاوداری بـــێ هـــێز لـــه رووی دنیـــادا
بـــڵێ بـــــــزانم چـــــلۆن ژیـــاوه

## ئینسانێ سپی و ئینسانێ رەشە

ئینـــسانێ ســـپی و ئینـــسانێ ڕەشــــــــە
مادده و دەنگ و ڕەنگ هەر لە سەر بەشە
نــەک هــەرئــەمانــە هــەمــوو عــەواریــز
له سەر تەقــسیمی وەزنــی بــێ غــەشــە

نـــەســـــاجی قـــەزا دای بـــەســـەر دارا
ریـــسمان چــەن جــۆر بــه ژوور و خــوارا
جـا دەرچــوو حاســڵ ئــەلــوانی قومــاش
بـــــلاو کــــــراون بــــه لادێ و شـــــارا

هــیچ کــەس نــازانێ ئــەنجــامی چییــە
دەفتــەری رەشـــە یــا خــود ســپی یــە

دلّ وا لــە بــەینــی خــەوف و رەجــادا
غــەیــری لــوتفی حــەق چــارەیّــی نییــە

خۆزگەم بەو کەسە بــە بــێ فــەلــسەفــە
خودای خۆی ناســی بــە بــێ بــەڵــکەفــە
رۆیــشت بــە ریّــگەی دەلیلــی بــەرزا
ئەگــەر لــە خــەلــەف ئــەر لــەســەلــەفــە

چونکــە وەن نــابێ ئینــسانی ریّـــڕەو
لە سەر جادەی عام بــەرۆژ یــا بــە شــەو
ســەرگــەردان یــارۆی ڕێ گــوم کــردووە
بــەملاو بــەولادا ئــەچــەرخــێ بــە دەو

رانــی بــێ شــوان بــەشــی فــەنایــە
ئــەگــەر بــەگورگــە یــا بــە ســەرمایــە
عالــەم کۆمــەڵــی ئوممــەتــی خــێرە
ئــەگــەر تــابیعی ڕای موســتەفایــە

ئینــسان بــەدڕایــە بــە بایّــی گــەرمــە
بە بای بادەوەیــش بــانگی بــێ شــەرمــە
بــەهــەر بایّــی بــێ هــەر بــایی نــەبــێ
عاقیبــەت خــێرە و جــێگەکــەی نــەرمــە

(نــامی) چــەن جــارێ بــەراوردی کــرد
لــیّکی دایـــەوە موشــکیلاتی ورد
ئــەونــە حالّــی بــو ئینــسانی ســالم
بــە ویّــنەی ســارا ئــەڕوا لــە ســەر پــرد

## قودرەتی خودا سنووری نییە

تــەقــدیری هــێزی تــەوانــایی خــوا
نــاتوانێ هــەمــوو هــێزی ماســیوا
ماسـیوا هـەمـووی بـە قـودرەتـی ئـەو
پــێ بکــرێ باســی تــەوانــائی خــوا

کائینــات هــەمــوو لای ئــەو کایــەکــە
ســەمـاوات بــە قــەی سـروەی بایـەکـە
کـە خواسـتی هاتـە سـەر فـەنـای دنیـا
کــێوانی دنیــا چــون هــەبایــێکە[١]

لـــەلای ئـــێمەدا دەریـــا دەریایـــە
ئەم عـەرزە عـەرزە و سـەمـا سـەمایـە
ئـەنـا لای خـوا هـەرچـی مـەوجـوودە
بـەشـی حـەرەکـەی مـەئمـووری بایـە

خـــوا خوایـــێکە ئاگـــا و خـــەبـــەردار
بـــو کـــوللی و جـــوزئی زانـــا و ئاگـــادار
هـــەر ئـــەو ئـــەتـــوانێ تـــۆ بپارێـــزێ
لـــە دەرد و بـــەڵای چـــەرخـــی رۆزگـــار

ئـەگـەر خواسـتی بــێ وات ئـەپارێـزی
نــەدا لــە بــەر پــێت لــە کــێوا رێــزێ

کـە خواسـتی نـەمـا وات ئـەخاتـە داو
سـوپای سـەرزەوی تـۆ نـەپارێـزێ

هـەمـو شتـێکی پـێ ئـەکـرێ خـودا
مـومکینی مـەحـاڵ نییـە لای خـودا
(قـبض) و (بـسط)ی تـۆ لـە لای خودایـە
نوقـسان و کـەمـاڵ وا لـە لای خـودا

وشـتر لـە دەسـتا ئـەشارێـتەوە
کـە چـاو بـە دوربیـین نـەیبینـێتەوە
مـێروله وردەیـش وائـەخاتـە دەر
چـاوی مژمـۆریش بیدۆزێـتەوە

( نـامی) هـەر پـەنـای لـە لای خودایـە
هـەر ئـەوە بـە حـەق کـە تـەوانایـە
وجـوودی زات و سـیفاتم هـەمـوو
بـە پـەرتـەوێـکی خواسـتی خودایـە

## کوڕی باش کێیە؟

کوڕ ئەو کوڕەیە کانی ئاڵـتوون بـێ
بـە ئـەسـتووری دڵ وەک بێـستون بـێ
بۆ هاڕینی ئارد بـەردی کەتـوو[1] بـێ
بۆ گەڕانـی هـەرد عـەییـاریتـوون بـێ

[1] - ناو کێوێکە لە شارباژێر بەرداشی زۆرە . خاڵ

کوڕنەوکوڕەیە ئەونـە ئـــــەکـرەم بـێ
تـاجی شـەرەفـی بـەنـی ئـادەم بـێ
ئەگــەر نـاقیس بـێ لـــە دارایـی دا
لـە وەزعـی حـاڵا وێـنەی عـەلـەمبـێ

ئەونە ئینسان بێ بە شـیرینی خـــوو[١]
وێــنەی فریـــشتە بنوێــنێ بـــە ڕوو
بەردەوام لـە سـەر کـرداری مـــەردی
لـــە جـادەی مـەردان لانــەدا بـەمـوو

بە فیـداکاری بـۆ گـــــەلی ئوممـەت
بـە بـوردەبـاری و بـە بـەرزی هیممـەت
بـاوەڕ ئـەکـەن پـێت دۆسـت و دژمنـان
ئەگـەی بـە پایـەی سـەرداری ئوممـەت

هێزی بـڕوای خـەڵـک ڕێـزی ئیعتیقـاد
گــەلـێ تیژتـرە لـــە شـێری فـولاد
ئەوەی کـە باوڕ ئـەیکـا بـــۆ سـەرۆک
نایکا سـەد هـەزار سـوپای یـەک نـەژاد

تەعەسسوب ئـەگەر لـەسـەر عـەنـادە
مـاوەی زۆر کـەمـە بـۆ خـۆی بـەربـادە
بەڵام حەمماسێ لـە سـەر بـاوەڕ بـــێ
مـــاوەی ژیـانی یــەومـی مـەعـادە

---

[١] - ڕەوشت

جا نەخوازەالله باوڕێ حەق بێ
لە قەیدی هەوای نەفام موتڵەق بێ
بە ڕەشەبای شووم نالەرێتەوە
مەگەر بە خواستی قەهھاری حەق بێ

(نامی) گەلێ جار بە هێزی باوەڕ
خۆی ئەهاوێتە ناو جەرگەکەی شەڕ
لە باتی ئەوە بڕواتە فەنا
ئەگات بە بەهرە ی بەرزی خەیر و فەر

## چەن چوارینە

قسە یەکێکە باقی بە تاڵە
بەبێ ئازادی شادی مەحاڵە
ئازادیش نییە بێ ئازادی دڵ
ئەمەش بێ خودا بە خودا بەتاڵە

هەرای کائینات لە سەر ماددەیە
ماددەیش خۆراکی ساقی و بادەیە
بۆ نێرێ نەبوو زاڵ بێ بە سەریا
دەرکا ئەم ماددەی سوکی سادەیە

ئەگەر بۆ جاهە بە وێنەی چایە
هەزاری تێ کەوت ڕۆیی بەزایە
ئەگەر هەوایە و خۆراکی وەختە
بەڵێ لەوەڕی وشتر و گایە

بە کورتی ئەڵێم بە بێ ئیعتیدال
قەت دەس ناکەوێ فەردێ لە ریجال
مەبەس لە ریجال ئینسانی ساغە
ئەوەی تێک نەچێ بە واتەی دەججال

لە سی زیاتر بۆ ئاخر زەمان
دەریێ دەجاڵی بێ دین و ئیمان
یەک لە یەک بەدتر بە مەکر و حیلە
ئێتە فەریبدان بە عەهد و پەیمان

پیاوی سوێند خۆر سوێندی نادرێ
قەت بە پەیمانی باوڕ ناکرێ
ئەوەی کەدژ بێ بۆ خودا و رەهبەر
بە هەزار تۆبە تۆبەی نادرێ

ئینسان ئینسانە نەک کەمتیارە
چۆن تەفرە ئەخوا بەو چەن وتارە
هەزار شانامە بخاتە شمشاڵ
گوێی بۆ ناگرێ ئەوەی دڵدارە

(نامی) تۆیش سادەی بەهەزار قورئان
لوتفی حەق نەبێ لائەبەی پەیمان
بپارێڕەوە بەڵکو بە ڕەحمەت
خاتیمەت بۆ بێ بە نووری ئیمان

## چۆن بژین باشە

برایەتی بازێ لـــە سـەر نـەسـەبـــە
بازێـکیش لـە سـەرکـردە و حـەسـەبـە
بازێکیش لە سەر رۆژە و مـەسـڵەحـەت
مـــەسـلّحەت نـــەمـــا (جـــرّ القـــصبه)

برایـــەتـــی خـــۆشە بـــۆ (مـــؤانـــسه)
تـــا دەر نـــەکـــەوێ رووی مونافـەســـە
کـــە ئیختیلافــی هـــــەوا هاتـــــە جــێ
موزایـــــەدەیـــــە (فـــــی المناقـــصه)

مادام برایــی بـــــۆ مـــــەحـــەبـــەتـــە
ئـەو مـەحـەببـەتـە خـاوەن حیکمـەتـە
بە گـە نجـی و پیـری و لاتـی و دارایـی
بـــۆ تـــۆ مـــوعینی خـــاوەن رەحمـــەتـــە

یـــانێ ئـــەو حوببـــە کـــە بـــۆ خـــودایـــە
هـــەر ئـــەوە باشـــە لـــەم رووی دنیایـــە
خـــەرمـــانێ جـــێگەی هیـــوا و ئـــومـــێدە
کـــە دانـــەی زۆر بـــێ ئـــەلبـــاقی کایـــە

بـــەڵـــێ بـــۆ ژینـــی دنیـــا بـــــە خۆشـــی
پێویـــستە پاریـــز لـــە بـــای نـــەخۆشـــی
بـــۆ پـــاکی دڵ و مـــەنـــزڵ و بـــەرگـــت
لـــە گـــەڵ روخۆشـــی ئـــەبـــێ تـــێکۆشی

تا سـودت بـبێ لـە بـۆ گیـان لـە بـەر
لــە نــاو کۆمــەڵا ئــەکــەویتــە بــەر
دەســتت نایابــە لــە بــۆ مــاچ کــــردن
ســەرت پیــرۆزە بــۆ سوێــندی بــە ســەر

ئــەمانــە هـــــەمـــــوو یاســـــای ژیــانن
بـــۆ پارێـــزی تـــۆ لـــە بـــای زیـــانن
بــەڵام ئیخلاســـت بـــۆ زاتـــی خــــــودا
لــە گــەڵ دەوامــا رەحــەتــی گیــانن

(نامی) بــە زوکـامسـەری ئـێش ئـەکـا
بۆیـــە وراوەی کـــەم و بـــێش ئـــەکـــا
ئەوەی بــەحیکمــەت نــەژی لــە چــەرخـا
بــە ئێــشی ئــەییــام دڵــی ئـێش ئـەکـا

## چەن ئەسبابێ هەن بۆ سیححەتی تۆ

چەن ئەسبابێ هەن بـۆ سـیححەتـی تـۆ
ئەبن بـــە مایــەی ئیــسراحـــەتــی تـۆ
یەکـەم: تـەسـلیمی نـەفـسە بـە خـودا
بـۆ دیــن و دنیــا بــەهــەشــتە بــۆ تــۆ
دووهــەمــین: دووری لـــە داخ و مـــەراق
گـــــوشادی دڵـــە بـــۆ وەزعـــی ئافــاق
چونکـــە موشـــکیلەی ئـــەم دنیـــا زۆرە
ئەبـێ هــەڵ بگـری چــەن کـۆزە تریـاق

سوحبەتی مەردی دڵ ئـەسـتووری چـاک
دڵت ساف ئەکـا وەکـــــوو مینـای پـاک
هەناسەی نەفسی هـەڵـمی سـەرجامـە
پــاک ئــەکاتــەوە دەروونــی غــەمنــاک
سێ هەم: پارێــزە لـە خـۆراکی بـــــەد
ئەوەی نـەگـونجێ بـۆ سـاغی جـەسـەد
هـاتو ناچـار بـووی بـا وێـنەی دەرمـان
حــەددێــکی بــبێ لانــەدا لــە حــەد
پارێز لە سـەرمـا فـەرزە لـە سـەرمـان
هەر وەهـا گـەرمـا ئامـان سـەد ئـەمـان
هەردوو کوشـەنـدەن لایـان دا لـە حـەد
حاشا لـە هـەر دوو ئـەویـان و ئـەمیـان
ئـەڕۆمـە دەرێ سـەرمـا ئـەمکـــوژێ
ئەڕۆمـە ناومـاڵ گـەرمـا ئــــەم مـژێ
یــارەببــی چیبکــەم لــە دەس ئــەمانــە
ئەمیان ئەم مژێ و ئـەویـان ئـەم کـوژێ
چـــــوارەم: پارێــزی تاقــاتی وجـــود
لــە (مالایطـــاق بالحـــد الموجـــــــود)
شت کە لەحـەددی تاقـەی تـۆ دەرچـوو
خـواهی نـە خـواهی ئـەتکـا بـە نـابوود
تایبـەتـی سـەرفـی تاقـاتی جینـسی
سـەممـی قاتـڵە ئـەگـەر ئـەپرسـی

(نـامی)ئینـسان بـێ پێویـستی حـەددە
ئە گەر حەیـوان بـێ بـۆ لـێی ئـەترسـی

**شێخیەتی دێهات بە چێشت و نانـــە**

شێخیەتی دێهات بـە چێـشت و نانـــە
بـــۆ شارسـتانی عـــەقـڵ و عیرفانـــە
نیسبەت بەعـەوام هـەر جـێ‌پـێ ئـەڕوا
بـەڵام بـۆ خـەوواس خـەیلـێ گرانـە
تا روشدت نـەبـێ بـە مـــوڕشید نـابی
بـێ موسـاعەدە مـــــوساعید نـابی
ئینـسان بـێ زەحمـەت ناگـا بـە مـوراد
جیهـــادت نـــەبـــێ موجاهیـــد نـــابی
پایـەی حـەقیقـەت بـــە داوا نـابێ
داوای مـەعریفـەت بـە هـــەوا نـابێ
ئـــیخلاس بـــۆ خـــودای (رب العـــالمین)
بـێ تـەرکـی تـەمـای (ماسـوی) نـابێ
ئەوەی کە خۆی‌کوشت بـۆ بـەنـی‌ئـادەم
مردیش زیندوە لـە سـەر رووی عالـــەم
بـێ (فکـر) لـە زات ناگـەی بـە پایـە
نـابی بـە خـاوەن بـۆ ئـالاّ و عـەلـەم
ئەپرسـی ئـە بـێ تـەفـاوەت چـی بـێ
عیلمـی زاهیـر بـێ یـا مـەعنـەوی بـێ
ئـە لێیم مـەعنـەوی کـاتێ کـەفـەوتـا
ئەوهـامی ئـەتبـاع فـەورەن دێـتە جـێ

بــەڵام کــە زاهیــر نــــەمــا لــــە دڵا
نــەزانــی جــێی گــرت لــە نــاو مــەنــزڵا
چونکە زاهیــر بــوو رێــی ئــەوهــام نییــە
دامــــاوان بـــدا بــــە ســــەر موشــــکڵا
خــودا بــۆ خــاتر حــەبیبــی عــەلــلام
خــاوەن ئــادابی شــەریعــەی ئیــسلام
مەمــان کــە بــە هــۆی فیتنــە بــۆ عالــەم
مەمان کە بــە جــێی تــەئییــدی ئــەوهــام
(نــــامی) تــــا مـــاوە بـــە رووی دنیـــاوە
بـــە زاهیـــر ئــــەڕوا بـــەلای خــــوداوە
ســـەفــای بــاتنیش بــە دەســتی ئــەوە
بــێ بــەشــمان ناکــا لــە لای عوقبــاوە

## بە بێ خواستی خوا هیچ شتێک نابێ

وجــودی زات و وەســـف و ئـــەحواڵـــت
ســاغی و گــەدایــی و دارایــی مـــاڵـت
هـــە مـــوو ئیبـــداعی زاتـــی خودایـــە
مایــەی نوقــسانی و پایــەی کــەماڵــت

کــاتێ خواســـتی بــو تــەوفیقــت بــدا
وەزعـــێکی وەهـــا باشـــت پـــێ ئــــەدا
چــەن دەقــێقەیــی لــە ئــەوقــاتی تــۆ
لــە غــەیــری خــێرا بــە زایــە نــادا

ئـــەوەی پێویـــستە و والـــە دوور وڵات
کـــاتێ ئـــەزانـــی حـــازرە لـــــە لات
ئەوەی مەبەستە بـە بـێ مانـدوو بـوون
ئـەیهـێنن بـۆ تـۆ بـێ مـوزد و بـەرات

ئـــەوەی بـــە دژت زمـــان هـــەڵ بـێنێ
بیـــەوێ پایــــەی شـــانت بشکـــێنێ
یـەکـێ ئـە نـێرێ حـامی بـێ بـۆ تـۆ
بـە خـۆی نـەزانـێ دای ئـەتـەکـێنێ

کە بـــــەڵایـە هـات ئـەتخاتـە قـــەڵا
بـەڵایـش ئـەنـێرێ بـۆ سـەرئـەو بـەڵا
وات ئـــەپارێـــزێ بـــە خـــۆت نـــازانی
وەکـــوو منداڵـــی بـــێ دەنـــگ و ســـەڵا

حەتتـا فریـشتەی پیـرۆزی خـــۆش بـۆ
ئەکا بـــە مـەئمـور بـۆ سـەر دڵـی تـۆ
نوورانیـت ئـەکـا و بـاش ئـەتپارێـزێ
لـە ئیلقـای فکـر و خـەیاڵـی بـەد بـۆ

ئـەگـەر ئـــەم دنیـا ببێ بـــە تۆفـان
کەشتی ئـە نـێرێ لـە گـەڵ کـەشـتیوان
نـــە ئـــاو نـــەتـــوانێ تـــۆ بخنکـــێنێ
نـــە ئـــاگر ئـەکـا تـەئـسیری سـوتان

(نـامی) بـە لـوتفی خـودا تـۆ سـامیت
لـە سـەر ئوسـوڵ و یاسـای ئیـسلامیت

ئــەگــەر (قاصــر)ی لــە رووی رەفتــاردا
لــە نــاو (دائــر)ەی عولــەمــای نامیــت

**خودایا هەرخۆت بە راسی خودای**

خودایــا هــەرخــۆت بــە راســی خــودای
زینــدوو بـــە زات و زانــا و تـــەوانــای
بــە خواســتی راســتت جیهانــت دانــا
چ وشــکی و دەریــا چ بــەرزی ســەمــای

دات‌ڕشت بەقاڵب هەمــوو مــەسـنووعات
بە پێی عەتــای خــۆت لــە ئیــستیعدادات
وجــوود لــە تــۆ ۆۆ جــودیش هــەرلــەتــۆ
هەر لە تــۆوە هــات فــەیــزی بــەرەکــات

کانت درووس کرد بە چەن نــەوعــەکــان
لــەعــەرزا دات‌نــا تــەکــانی بـــوورکان
بــەبـێ ریــشە وتــۆم گوڵــزارت دەرکــرد
بـــە دارو درەخـــت رازاوە جیهـــان

گیان لـــە بـــەرانــت هــێنایە زووهــوور
چ لــە چــەرەنــدە و پــەرەنــدەی نــودوور
ئــادەمــت هــێنا بــۆ ئــەسڵی بــەشــەر
دڵ و دەروونــت رۆشــن کــرد بــە نــوور

ئـــەونـــە خـــاوەنـــی بـــۆ (تَــصَرُّفات)
ئـــەونەت لـــە لایـــە لـە (قابلیّــات)

نـە شێوە شێوە نـە دەنـگ وەکـو دەنـگ
نە رەنگی دووکـەس بـە جـۆرێ دەرهـات

سیما و نـاو چـاو و چـاوان و رووخـسـار
رازانتـەوە گـشت بـە وێـنەی گـوڵزار
خەتی ناودەستو پەنجە و سـەرپـەنجـە
کـردت بـە رەمـزێ لـە پـەروەردەگـار

عـیلم و مـا بـاقی سـیفاتی بـەشـەر
هـێنات بـە ئـە نـواع (الله اکبـر)
لـە یـەکـەم پایـە تـا بـە میلیـارات
ئیختلافـتدا بـە پایـەی بـەشـەر

(نـامی)ش یـەکـێکە لـە مـەسنووعاتت
لە نـەوعـی بـەشـەر لـە مـەخلووقاتـت
سـاخودا بـەرەحـم خـەلاسـی فـەرمـوو
لـە تـاوان بـاری بـۆلای تاعاتـت

## خۆزگەم بەو کەسە

خۆزگەم بەو کەسە کە سـەنعـەت ئـەکـا
بـە حاسـڵی خـۆی قـەناعـەت ئـەکـا
سـەری داناخـا، لـەبـۆ کـاری دوون
بـە دڵ ئـارەزووی رێـی ریفعـەت ئـەکـا

گڕە و هـوڕە و بـا و هـاژە و خـوڕەی ئـاو
وێـنەن بـۆ ناڵـەی پیـاوی ناتـەواو

ئــاخ لــە بــۆ رەزا و تــەسلیمــێکی دڵ
تــا داخــو و ناڵــە نــەهێنــێتە نــاو

ئـاخ لـە بـۆ هۆشـێ دامـەزرێ بـۆ دڵ
بـۆ خـۆی رێ بکـا بگاتـە مـەنـزڵ
چیبکەم لە کەلـلەی بێ هـۆش و دەمـاخ
وتـت هۆشـت بـێ فـەورەن دێـتە کـوڵ

ژێـرێ کـەرێـکی دی لـە نـاو رێـدا
چوو پۆزەی ماچ کـرد لـە عـەینـی جـێدا
پـێیان وت بـۆچی وتـی بـە هۆشـێ
رێـک رائـەوەسـتێ نـاروا بـە رێـدا

وتـت بـە نـەفـام بیـر بکـەرەوە
وەکـــو دورەنـــدە دێـــتە دەرەوە
ئـەرموسوڵـمانێ دەسـتی ئـەو نـەگـرێ
ئـەتـدا بـە عـەرزا لـە لای سـەرەوە

ئـــاخ لـــە بـــۆ دڵـــێ وا بکرێـــتەوە
جـــێگەی جیهـــانی تیـــا ببـــێتەوە
هـــەزار موشـــکیلەی تیـــادا وەن بـــێ
مـــەگـــەر دوربیـــنێ بیـــدۆ زێـــتەوە

دڵـی تـەنگـەلان دنیـای لـێ تـەنگـە
هـەمیـشە جـێگەی ئاشـوب و جـەنگـە
بـێ بـە پاشـا هێـشتا گـەدایـە
ئـەفلاتـونیش بـێ هێـشتا دەبـەنگـە

مـــێروله ورده چـــوون بـــه دڵ ژیـــره
لـــه لای ســـولەیمـــان وێـــنەی وەزیـــره
گـــەورەیـــی لـــه ســـەر قـــەواره نییـــه
گـــەلـــه گـــەلـــێ‌کـــه و یـــەکـــێ مـــودیره

### یاسای ژیانی باش

ئـەتـەوێ بژیـت بـۆ خـۆت بـه خۆشـی
بکـــەره بـــەرت بـــەرگـــی روو خۆشـــی
واتـــه شـــیرین بـــه لـــه گـــەڵ یارانـــا
لـــه ززەتـــی دنیـــا هـــەمـــوو ئـــەنۆشـــی

کـــەسبـــێکت بـبێ لـــه بـــۆ ژینـــی خـــۆت
قـــه ناعـــەت بکـــه بـــه پـــەرژینـــی خـــۆت
داوای هیچ مـــەکـــەلـــه بـــێگانه و خوێـــش
دنیـــا ئـــەبـــێته بـــه هـــەشـــتێ لـــه بـــۆت

هـــاتو وادەت دا بـــێ وەفـــا مـــەبـــه
کـــاتی گلـــەیـــی پـــڕ جـــەفـــا مـــەبـــه
ئاموشۆی خەڵـــکت لـــه ســـەر یاســـا بـــێ
دوور لـــه ســـوننەتـــی موســـتەفـــا مـــەبـــه

له سیلەی رەحما قـەت قوســـوور مـــەکـه
با ئەوان دوور بن تـــۆ خـــۆت دوور مـــەکـه
هـــەتـــا مـــومکین بـــێ بـــەخشـــشت بـبێ
هەرگیز به وشکی خۆت مەشهوور مـــەکـه

بـا دڵـت دایـم خاوێـن وپـاک بـێ
لە باسی خـەڵـکا بـا قـسەت چـاک بـێ
کـاتێ بانـگ کـرای بـۆ موهیممـەیـێ
پـشتت ئـەسـتوور و دڵـت چـالاک بـێ

هـارو جـەسـوور و کـەللـە رەق مـەبـە
بۆ ئیسلاحی بەین دوور لـە حـەق مـەبـە
ئینـسافت بـبێ حـەق بـدە بـە ئـەهـل
بۆ غەیبەتـی عـام موسـتەحـەق مـەبـە

حەق بـدە بـە غـەیـر بچـووک و گـەورە
هـەسـتە و دانیـشە بـە یاسـای دەورە
دەرمـەچـو لـە عـام لـە مـەشـرووعاتا
حـەق لـە بـۆ کـێ بـێ بـڕو بـەوتـەورە

دوور بـە لـە ریـا دوور بـە لـە نیفـاق
تێ کۆشـە لـە بـۆ بوڵـەنـدی ئـەخـلاق
قـەت درۆ مـەکـە هـەتـا ئـەتـوانی
بـە م جـۆرە ئـەبـی بـە میـری ئافـاق

عـەلاقـاتی پـوچ خـەیـاڵاتی خـاو
لـە لای وەهمـەوە دڵ ئـەخاتـە نـاو
نـازانێ کـارێ بکـا لـە بـۆ خـۆی
تا عەزرائیـل دێ لـە سـەر جـۆش و تـاو

لـە سـەدا یـەکـێ بیـر ئـەکاتـەوە
لـە کـاتی هاتـا لـە نـەهاتـەوە

لە سەدا یەکێ تۆشە هەڵ ئەگرێ
بۆ ڕێگەی دووری دوور وڵاتەوە

تامنداڵ نییە هەر قۆڕە قۆڕە
کە منداڵیش بوو هەر گو بە گۆڕە
ئینسانی داماو لە بەر نەفامی
لە دنیا و دینا هەر سەری شۆڕە

بە گەنجی مەستە و بە پیری سستە
کاتی دارایی بایی و سەرمەستە
کاتێ ئەزانێ ڕۆژی تەواو بوو
جا لە بێ حاڵی دەروونی پەستە

عەوامی داما و بەشی خۆیانن
هەر بۆ لەوەڕە شتێ بتوانن
ئەوەی ئەفامێ و دەستێکی هەیە
ئەوانەن مەسئول ئەگەر بفامن

فەقەت بەو خودا هەر خۆی خودایە
بەم وەزعە هەتا دنیا دنیایە
فامیدەی بایی بە وێنەی نەفام
لە لای تاریخا بە حەق ڕیسوایە

بە نەفسی نەفسی عومرمان دەرچوو
بە هەوای شەخسی کارمان تەواو بوو
قوڕم دا بەسەر نەفس و هەواتا
چی بەجێ دێڵی کە ڕۆحت دەرچوو

ئــیخلاس بــە راســی نــوکرانی زاتــە
تــا خۆتــت بــوێ مایــەی ئافاتــە
ئــەوەی (نــامی) بــوو لــە بــاغی ژینــا
مــونکیری نــەفــس و بــای خــەڕافاتــە

**ریسالەت راسە**

ریسالەت راستــــە و وەحــــی (صـادق)ە
مــەدلــوولی هــەمــوو لــە (حقــائق)ە
هەر عیلمی ئــەوێ و ئینــساف و ویجــدان
بــڕۆین بــەو ریّــدا وەهــا لایــەقــە

مەدلوولی زاهیر ئەکــەیــن بــــــەئیمـام
ئەیکەین بە ئەساس بۆ هەموو ئــەحکـام
بــــە بــێ دەلیلــی مــانیعی قــــەتعــی
قەت لانادەین لــێی بــە تــوولی ئــەییـام

(تأویـل) پێویــستە بــۆ ئــەمــری موجمــەل
بەمــەرجــی راســتی (مرجـع) و (محمـل)
نە (بیض)ە( بیض)ەی خـــودەی زێـــڕینە
نە (حبل)ی (حُبلـی) ســەفینــەی (معمـل)

عاممەی ئەسحاب و گـــــەلــی تــابعین
ئەهلی لۆغەت بوون هــەمــوو ئــەجمعــین
غەریبــە لادەیــن لــە فــکری ئـــــەوان
لە سەر وەسوەسەی شــەیتــانی لــەعــین

(اجماع) دامەزرا یا ئەکسەرییەت
ئەعلا دەلیلە بۆ بەشەرییەت
دەرچوو لە دەستی ریعایەی راعی
یا تەعمەی گورگە یا جێی بەلییەت

ئەمە یەرێگەی حەزرەتی رەسول
ئەمەیە مایەی سالک بۆ (وصول)
تەوزیحت ئەوێ برۆ بۆ سوننەت
ئەداتە دەستت حاسل و (محصول)

ئەوەی وا لەسەر رێگەی موستەفا
ئەژی بە خۆشی و ئەمرێ بە سەفا
ئەوەیش لائەدا لەم رێگە پانە
ئەنجامی دەردە و میحنەتە و جەفا

ئەویان لە سایەی رەحمانە و رەحیم
ئەمیان لە پایەی شەیتانی رەجیم
ئەویان مەنزڵی باغی بەهەشتە
ئە میان دۆزەخو شەرارەی فەخیم

**بەهرەی نبووەت**

بەهرەی نبووەت فەیزە لە باری
نەک بە کۆششی سامی یا ئاری
لە مەواهیبە نەک لە مەکاسیب
وێنەی پیرۆزی بە بەختیاری

بـــەلام ویلایـــەت لـــە ســـەر جیهـــادە
لــە ســەر تـــەربییـــەی پیــری ئیرشــادە
هەرچەن سەرچاوەی ئـەمـیش عـەتایـە
عەتای حـەق نـەبـێ عـەمـەل بـەربـادە

عینایـــەت یـــانێ ئیحـــسانی خـــودا
کـــاتێ کـــە بـــاری و ڕژا بـــە ســـەردا
کـــاتێ ئـــەزانـــی پایـــە و مایـــە و حـــاڵ
بە وێـنەی لیبـاس ئـەکرێـن بـە بـەردا

شـنۆی نـەسـیمی ڕەحمـەتـی ڕەحمـان
ئەبـێ بـــە مایـەی ئیمـان و ئـــەمـان
موعــەتتــەر ئــەکـا ڕۆحـو سـینە و دڵ
وێنەی پـەرەی گـوڵ بـۆ سـەر و دامـان

هۆی ئەو نەسیمەیش جیلـوەی ئیحـسانە
جیلـوەگاکـەیـشی ســینەی ئینـسانـــە
بـــە ختـــە بارانـــە ڕەحمـــەتـــی خـــودا
وێـــنەی بـــارانی دوای نـــەیـــسانە

تەوفیـق غـەیبی‌یـە دێ لـە لای خـودا
ئـەعـلا نیعمـەتـە بـۆ چـــەرخـی دنیـا
هیوامـــان وایـــە بـــەش داربـــین لـــەوا
هـــەتـــا بگـــەینـــە مـــەرتـــەبـەی عولیـا

خـودا لـە دەریـای فـەیـزی تـــۆ نمـێ
ئەبـێ بـە دەریـای قوڵـی (قـــولـیجێ)

چـاوە ڕێــی دەوایــن لــە بــۆ زامــی دڵ
بنــێرە بۆمــان ئــەنفــەع مــەرهــەمــێ

پــەروەردەگـاری ســـــەراســەر جیهــان
خـــــودای زانیـاری زاهیـر و پــەنهــان
(نـــامی) بــــە کــــەرەم بلاوێـــــنەوە
تــا ســەری بگــا بــە تــاجی شــاهان

**کە ویجدان نەبوو ئیمانیش نابێ**

ئینـسانی تـەنگـاو لـە کـەس ناتـــرسێ
لە گـەورە و بچـوک قـەتعـەن ناپرسـێ
چیهـات بـە دڵـیا دێ بـە سـەر دەمیـا
ئیتــر بــێ باکــە، لــە شــەڕ ناخلــەســێ

جـا بـا بـــــەرابــەر بـــــە دامـاوەکـان
لـە دڵ پـڕ لـە دەرد لـە تـەنگـاوەکـان
زوو ئامـــادە بـــین بـــۆ دەرمـــانی دەرد
بەر لـەوەی ئـەوان بـێنە سـەر تـەکـان

ئـــاگر بـــە ئـــاوێ ئـــەکوژێــــتەوە
بـەفـریش بـە هـەتـاو ئـەتاوێـتەوە
گیـرۆدەی مـەینـەت لـە چـەرخـی دنیـا
بــە یارمــەتــی دان ئــەحــەســێتەوە

دین و دنیـای حـەق لـە سـەر ویجدانـە
هەر خـاوەن ویجـدان مـەردی مـەیدانـە

ئینسان وەهابێ ویجدانی ئەبێ
دێوە درنجە گورگی غیلانە

کە ویجدان نەبوو ئیمانیش نابێ
کە ئیمان نەما ئیحسانیش نابێ
ویجدان و ئیمان شەرتی ئینسانن
ئەمانە نەمان ئینسانیش نابێ

بۆیە مەشهوورە ئوممەت ئەخلاقە
ئەخلاق پیرۆزی هەموو ئافاقە
کە ئەخلاق نەما ئەحواڵی ئینسان
مەکرە و حیلەیە و دەرد و نیفاقە

حەزرەتی رەسول لای خودای کەریم
هەرچەن شایا و بوو شانی بۆ تەکریم
کاتێ هاتە سەر سەنای پێی فەرموو
(إِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ)[١]

(نامی) بە دەوام ئەپارێتەوە
بەڵ درگای خێری بۆ بکرێتەوە
وەربگرێ بەشی لە ئەخلاقی بەرز
بە بێ ئەخلاقی نەتلێتەوە

---

[١] – واتە: بە راستی تۆ لە سەر رەوشتی بەرزی

## پەروەردگارا

پـــەروەردگـــارا خـــاوەن ئیحـــسانی
خـاوەن رەحمـەتـی هـەردوو جیهـانی
رەحمـەت ئـەبـارێ بـە وێـنەی بـاران
بۆیـــە غـــەففـــاری تـــاوان بـــارانی

(وجـــودی واجـــب للقیـــوم الحـــیّ)
لـە لای عـاقڵان تـەنیـا هـەر تـۆ هـەی
تخـــرج الحـــیّ مـــن المیـــت
کمـــا تخـــرج المیـــتَ مـــن الحـــیّ

خـودای میهـرەبـان هـەتـاکوو ئـەمـرم
بـە دڵ بـە زوبـان ئامـادەی شـوکرم
هەرچەن شوکری تـۆ قـەت تـەواو نـابێ
پێویـستە بـەشـی واجـب هـەڵ بگـرم

ئـەونـە بـە کـەرەم گرتوتـە قـەدرم
فریـام کـەوتـووی لـە مـاوەی عـومرم
ئـەگـەر میلیـارێ تـاوانم بـبێ
هیـوام هـەر عـەفـوە لـەوکاتـا ئـەمـرم

ئـەربـۆم بێ شتێ لـە بارەی خێرات
لـــە رەحمی تۆوە بـۆلای ئێمە هـات
سـا بـەو رەحمـەتـەی عامـە بـۆ عالـەم
(نـامی) رزگارکـە لـە کـاتی نـەهـات

ئـــەوەنـــدە دارای فـــەیـــز و کـــەرەمـــی
لە گەڵ گیـان دارا نـەخـسوس ئـادەمـی
یارمەتـی ئـەدەی لـە سـەر کـاری خـێر
ئەیکـەی بـە مایـەی سـایەی عالـەمـی

یـانێ مـەبـدەئـی (فَیّـاض)ی بـە حـەق
ساحـێب کـەرەم و بـەخـشینی موتـڵەق
کەس ئـەم نیعمـەتـە ون نـابێ لـە لای
کە تۆی ئـەسـبابی هیدایـەی بـە حـەق

(نـــامی) کـــەوتـــووە لـــە بـــارەگـــادا
دەســـتە داوێـــنە لای موســـتەفـــادا
تکـام بـۆ ئـەکـا کـە تـۆ بـم بـەخـشی
تـــەوفـــیقم بـــدەی لـــە رێـــی ســـەفـــادا

## تەقوا بەرگێکە

تـــەقـــوا بـــەرگـــێکە بـــۆ دڵـــی ئینـــسان
بەو بەرگە ئـەژی و ئـەگـا بـە ئیحـسان
کـە تـە قـوای نـەمـا توێـکڵ لائـەبـا
بۆ خۆی وشک ئەبـێ وەک داری بێـسان

پێویستە بـە مـەرد پـەیـوەنـدی بـە دڵ
لـە گـەڵ خـودادا بـۆ کـەسـبی حاسـڵ
دڵ رووی لە حەق بـوو کۆمـەکـی بـۆ دێ
گیای روو لە هـەتـاو زوو دەرئـەکـا چـڵ

ئەگەر عەیبێ بوو هەر وا لە تۆدا
وا لە لەش و بەرگ لە رەنگ و بۆدا
ئیتر باسی دلّ با نەیێتە ناو
دەوای نادرە لای من و تۆدا

یەکەم: بەختیار ئەوەیە کە خۆی
تەمێی خۆی بکا بۆ هەواو درۆی
دووهەم: ئەوەیە تەمێ وەربگرێ
ئەگەرنا بگری بۆ بەدبەختی خۆی

بۆ عەقلّی نییە کە بەوێنەی چاو
(فارِق)ە لەبۆ تاریکیو هەتاو
بۆچی ئادەمی عیبرەت ناگرێ
لەم موشکلاّتە کەوا دێنە ناو

حەواسی خەمسە خادیمن بۆ دلّ
حازرن لە بۆ خزمەت کاری گولّ
کە دلّ فامی بوو ئەویش بە قەی خۆی
دوور ئەخاتەوە مەرارە و موشکلّ

دلّ گەر نەفامێ بێ سوودە حەواس
مەگەر بۆ دەرکی مەزاهیری ناس
مەزهەر پەرستی بت پەرستی‌یە
ئەگەر تالبی بۆ وتاری راس

(نامی) لە ژینا بەراوردی کرد
بە فکری زبر و بە ئەفکاری ورد

دنیـــا خـــەرمـــانی خـــێری خودایـــە
بـــەش‌داره لـــەوا خـــاوەن دەســـتو بـــرد

## وازم لێ بێنن

وازم لـــێ بـــێنن بیـــنم ئـــەتاســـێ
لـــەبـــاتی ســـەرم دڵـــم ئـــەماســـێ
ئیمـــانم هـــەیـــە بـــەزاتـــی خـــودا
خوانەبـــێ هـــیچ کـــەس ئینـــسان ناناســـێ

وا لـــە ســـورەتـــا فریـــشتە رەنگـــە
کـــەچـــی بـــە سیرەت دێـــوی دەبـــەنگـــە
بـــە دەم تـــالبی ئـــارامی عامـــە
بـــە دڵ خـــەریکـــی خـــەڕەکـــی جـــەنگـــە

کەس با تـــەزکییـــەی کـــەســـێ‌تـــر نـــەکـــا
خۆی کە بەدی کـــرد بـــەد بـــەتـــر نـــەکـــا
ئـــارام بـــێتەوە چـــەن ســـاتە عـــومرێ
خـــۆی لـــە ســـبەی‌دا رســـواتر نـــەکـــا

هەر کەس عەیبی خۆی بخاتـــە بـــەر چـــاو
ئیتـــر عـــەیبـــی کـــەس نـــەیـــەنـــێتە نـــاو
ئـــەگـــەر مـــاوەیـــە حاڵـــی وەهـــا بـــێ
بـــاش دائـــەمـــەزرێ بـــە بـــێ‌چـــاوە ڕاو

ئـــەڵـــێ کـــاکی خـــۆم قـــەلبـــی ســـەلیمـــە
قـــەت تورە نابێ ئـــــەوەن حـــــەلیمە

کـەچـی لـە باسـێ کـە دڵـت ئێـشان
ئـــەڵـــێی ئـــاگری دوور لـــە تالیمـــە

دنیایـــە دیـــتو ئـــەڕوا بـــە هـــەر حـــاڵ
خۆشی و ناخۆشـی و مـەینـەت و مـەلال
مـــادام خـــۆ گربـــی دنیـــا ئـــەگـــۆڕێ
نامـــێنێ مـــەگـــەر زاتـــی ذوالجـــلال

لە هەر چـەرخـێکا کـە هـەڵ ئـەسـوڕێ
پێویـــــستە عاقـــــل حاڵـــــی بگـــــۆڕێ
دوێـنێ دووپایـە ئـەمـڕۆ بـا سـێ بـێ
ئەنا چـوار پـێش هـەر هـەڵ ئـەسـوڕێ

ئینـــسان کـــە رووا بـــەرز ئـــەبـــێتەوە
نـــابێ بـــە بـــێ ســـوود بپوکـــێتەوە
ئەو کەسەی فەرقـی خـێر و شـەڕ نـاکـا
یـــاخودا بمـــرێ و قـــەت نـــەیـــێتەوە

## سوود

خـودا بـێ زەوق و رەنگـو بـۆم نـەکـەی
بێ دەستە و یەستەو نـان و دۆم نـەکـەی
سـاغیم پـێ بـدەی هـەتـا کـــو مـاوم
بێ چاوو بێ گوێ و گفتـو گـۆم نـەکـەی

نـرخم پـێ بـــدە بـەقـــەی کیفایـەت
تـەوفـیقم بـدە لـە گـەل عینایـەت

ئـەگـــەر مـــەقـام و شانـێکت پـێدام
شوێـنـم پـێ بـدە لـە گـەل ڕیعایـەت

خودا بە خودا کـەس نـەبـوو بـە کـەس
بێ میهرەبـانی و ڕەحمـەتـی ئـەقـدەس
مـادام وەهـایـــە عـــەقـڵێ وابـــدە
حـافزی دیـن بـێ تـا ئـاخر نـەفـەس

خـودا لـە دەسـت و داوێـنی خـەبـیس
لـە فکـری پـوچی هـەوێـنی ئیبلـیس
بمـان پارێـزە بـە ئیحـسانی خـۆت
مەمـان خـە داوی تـەزویـری تـەلبـیس

بمـان پارێـزە خــودای میهـرەبـان
لە مەکری نەفس و تـەلبیـسی شـەیتـان
لـــە فیتنـەکـانی ئـاخـری زەمـان
لـە دەردی بـەدی بـەڵای ناگـەهـان

ڕەواجـێ بـدە بـە گفتـو گۆمـان
ویقـارێ بـدە بـە ڕەنـگ و بۆمـان
لـە واتـەی بـەدگـۆ بـمان پارێـزە
هـەتـا موسـیبەت نـەیـەتـە کۆمـان

خـودا جـەلبـی خـێر بـە ڕەحمـی تۆیـە
خـودا چـاری شـەڕ بـە حیلمـی تۆیـە
لـە خـێر و شـەڕا بـۆ هـەر دوو دنـیا
عەداڵەت هـەمـووی بـۆ حـوکمی تۆیـە

(نــامی) نافــامێ مـــــەعنــای عیبــادەت
مــەگــەر بــە لــوتفی خــاوەن عینایــەت
هەردەم بە دوعــا و دەس بــەرەو ســەمــا
بــۆ فــەیــزی نــووری بــەرزی هیدایــەت

## خودا خواستی بوو

خــودا خواســتی بــوو بـــــۆ پارێــزی تــۆ
پێویــــستی نییـــە بـــە تـــەرێـــزی تـــۆ
تەرێـــز فــەرمانــە ریعایــەت ئـــــەکرێ
ئـــاگر بـــڕ ناکـــا لـــە پـــەرێـــزی تـــۆ

ئیبـــــراهیم لـــە نـــاو ئـــاگری تـــــاودار
یـــونس لـــە دەریـــای گـــێژی ناهـــەمــوار
دەرچوون بە ساغی لە سەر خواستی ئـەو
نـەک بـە پارێـز و تـەرێـزی ئـەبـڕار

قُـــلْ اِنَّ الْمَـــوْتَ الَّـــذِی تَفِـــرُّون
حُکْـــمٌ صَـــرِیح فِـــی مـــا تَقْرَئُـــون
هــەم (قـل لـو کنـتم فـی بیــوتکم)
حوججـــەتـــە؛ (اذا کنـــتم تهتـــدون)

لـــە پـــاش ئیـــستیلای گـــەلـــی بـــێگانە
گـــۆڕا ئـــەوزاعـــی ئـــەم رووی جیهانـــە
ئـــادەمـــی وێـــنەی درەختـــی ســـەمـــەر
پـــەیـــوەنـــدی کـــرا لـــەو نامـــەردانـــە

تــەفــاوت نــەمــا بــۆ شــار و لادێ
هەمووی کەوتە سەر یەک بار و یـەک ڕێ
ئــەوەی دەس ئــەدا لــە شارســتانا
لــە دێهاتیــشا جــێ بــەجــێ ئــەبــێ

بــەڵــکو لادێ‌کــان بــەدتــرن لــە شــار
لــە بــەر نــەفــامی گــەلــی بــەدرەفتــار
فــەرقــێ کــە بــبێ بــە خولقــە و ڕەفــێق
لە پاش تــەوفیقــی خــوای پــەروەردگــار

بــەڵام زۆر هیــوام ئــەستورە بــە خــوا
بـــارانێ داکـــا بـــە ڕۆژ و شـــەوا
دڵــمان پــاش مــردن زینــدوو بــێتەوە
بگـــەشـــێتەوە لـــە ســـای پڕ تـــەوا

## ترس و تەماع

تــرس وتــەماعــە دەس کێــشی ئینــسان
بۆ عیلم و سەنعەت بۆ تەقــوا و ئیحــسان
لــە گــەڵ نیزامــی چــەرخــی ڕۆزگــار
ئــەگــەر نــا ئینــسان نــابێ بــە ئینــسان
کــێ بــە بــێ زانــست ئــەروا بــە ڕێــدا
کێ بە بــێ ســەنعــەت ئــەژی لــە جــێدا
ئینـــسانی نـــەزان بـــێ کـــار و پیـــشە
هەرکەسێ هــەســتێ پــێ ئــەنــێ پــێیدا
تــرس و تــەماعــە بنکــەی عــەیــب و عــار
لــە دەشـــت و دەرا لـــە دێ هـــات و شـــار

عـەیـب و عـار نـەمـا ئینـسان حـەیوانـە
بـەڵـکو دوڕنـدەی سـەر قولـلەی کۆسـار
کـە تـرس و تـەمـا نـەمـان لـە دنیـا
مێـشک پـڕ ئـەبـێ لـە بـای کیبریـا
ئـەو بایـە وەبـای ژینـی عالـەمـە
لـێی رزگـار نـابێ مـەگـەر ئـەبریـا
دەمـاخ کـە پـڕ بـوو لـە هـەوای غـوروور
یاسـا نـامـێنێ لـە نـزیـک ودوور
سـەمـووم وەرئـەگـرێ و ئـەبـێ بـە ئـاگر
زوو ئـەسوتـێنێ دەشـتی شـارەزوور
جـا نـەخـوازەالله جـەهلـیش بـێتە لای
عـەنـادی نامـەرد بـبێ بـە هاوتـای
ئـەوکاتـە چـارە هـەر ڕاکردنـە
کـێویکت دەس کـەوت بڕۆیتـە پـەنـای
هـەوا بـوو بـە هـۆی گـومرایی ئیبلـیس
لەعنەتـی بـۆ هـات دەرچـو لـە تـەقـدیس
هـەوایـە مایـەی ویـرانی دنیـا
ئیـستە یـا ئـەوسـا( قـەدیـم) و (حـەدیـث)
(نـامی) لـە خـودا ئـەپاڕێـتەوە
بـە دەردی هـەوا نـەتلـێتەوە
بـەڵـکو لـەوکاتـا کـاتی نـشورە
بـێ هـەوای فـەسـاد زینـدوو بـێتەوە

## دووخشتەکی

ئـــەوەی ئــەوتــرێ هــەوایــە و ئــەڕوا
نووســـراو مــا لــە بــۆ خــاوەنــی مــاوا
جا تۆ بە دوسەر خــاوەن بــە خــشش بــە
هــەتــا وجــوودت هــەیــە لــە نــاوا

خــەلاتــی خوایــە دەوڵــەمــەنــی تــۆ
بــە راتــی خــەڵــکە خــواردەمــەنــی تــۆ
ئـــەو خـــێرەی کــــەوا بمێنــــێتەوە
مایــەیــە لــە بــۆ بــە هــرەمــەنــی تــۆ

نامرێ ئەوکــەســە کــە بمــرێ بــۆ حــەق
بە واتە و رەفتار لــە ســەر یاســای حــەق
نرخـــی ژیـــانی ئـــادەمـــی خـــێرە
بە مەرجی ئیخلاس لــە بــۆ رەزای حــەق

ئــەودەرزە ئــەیلــێیت بــە هــەر ئینــسانێ
داریــــکە ئــەینــێی لــە نــاو بێــسانێ
بە قەی قەسدی خۆت خێرت پــێ ئــەگــا
بـــا بیـــشی بـــڕێ نیـــوە ئینـــسانێ

ســونەی (حــسنە) و(ســیئە) هــەر دوو
هەر کەسێ بۆ ئەو مایەی مــەســدەر بــوو
هــەتـــا پاشـــە رۆژ بـــەش دارە لـــەوا
بۆ عامــل بــەشــێ بــۆ ئــەو دوو دەرچــوو

خۆزگەم بەو کەسە کە بوو بە کلیل
لە بۆ قاپی خێر بە وێنەی دەلیل
حەتتا ئیشارەی سەر پەنجەیێ بێ
مەحبووبە لە لای مەننانی جەلیل

سەیرە براکان ئینسانێ بنوێ
کەچی زەمانی بە خیرات بدوێ
بێ هەرا و سەدا نووستووە بۆ خۆی
کەچی درەختی بەراتی ئەڕوێ

هەزاران ساڵە بە یاسای تەقریب
وەفاتی کردووە خەلیلی حەبیب
ئیستەش حاجیان لە سەر بانگی ئەو
ئەڕۆن بۆ کابە (بعید )و(قریب)

بەبە لەم خانە و لەم خانەدانە
بەبە لەم پایە و لەم مایە جوانە
لە وادی بێ زەرع بێ ئاو و بێ تۆم
بە میلیار خەروار ئێتۆ بۆ خانە

بابای ئێمەیە حەسەب یا نەسەب
بێ تەفاوتە بۆ کورد و عەرەب
لە کوڕ باشترە ڕۆڵەی بێگانە
خدمەت کارت بێ بە حەیا و ئەدەب

خودایا بە حەقی نووری رەحمەتت
بەقەی دەوامی مایەی نیعمەتت

نـامی ببـەخـشە بـە ئیحـسانی خـۆت
بـا ئـارام بگـرێ لـە سـای رەحمـەتـت

ئــازادی فــەرزە بــۆ مــەردی وریــا
لــە مــاوەی ژینــا بــۆ دیــن و دنیــا
ئـازادی بـۆ دیـن تـەرکـی هـەوایـە
کـە ئینـسان ئـەبـا بـۆ پایـەی عولیـا

ئــازادی دنیــا ژینــە بــێ میننــەت
بۆ غەیری خودای بەخشەنـدەی نیعمـەت
فەرمان رەوابـێ لـە سـەر نـەفـسی خـۆ
بۆ بەرگ و خۆراک بـۆ تـەرکـی لـەززەت

لــەوە بترســن لــە خــوا ناترســێ
لـە خـوا نـەترسـا لـە حـەق ناپرسـێ
کـە حـەق بـێ نـاز بـوو خرایـە لاوە
ئیتـر موسـتەحـەق کـێ لـێی ئـەپرسـێ

لــە خــوا ترســاوان ناترســی لــێیان
بــەڵام بــە ئــەدەب بپرســە لــێیان
پیــاوی بــێ ئــەدەب لــە هــەردوو لاوە
جەزای بێ شـەرمـی ئـەگـەیـێ پـێیان

ئینــسانی دڵ پــاک دڵــی نالــەرزێ
شەخسی دەس پاکیش دەسـتی ناگـەزێ
کـە هـات داوێـنو دەمیـشی پـاک بـو
بــروا بــە گــژی شــادا نابــەزێ

قــەناعــەتــت بــوو منــەت ناکێــشی
کە سـنعەتـت بـوو زۆر بـێ ئـەندێـشی
ئـەم منــەت بـاریو ئــەندیــشەی دڵــە
بــە بــێ ســنعەتــی ئــەبــێ بیکێــشی

لـە سـەرە مـەرگـا هـەناسـەت تونـدە
چـونکی بـەنـدی دڵ بـە تـاوان بـەنـدە
ئــەوەی بــێ تــاوان ســەر ئــەنــێتەوە
ئــازادە و دڵــشاد بــە وێــنەی رەنــدە

نــەمـدی بـێتاوان قــەت ســەری داخـا
یــا لــە تــەنگــاوا بمــرێ لــە داخــا
هــەرتــاوان بــارە لــە هــەردوو دنیــا
دەســـتی وا لـــە نـــاو تـــاڵاوی زاخـــا

باوکێ وای فەرمـوو لـە گـەل کـورەکـان
فــڕو فــێڵ مــەکــەن لــەگــەل براکــان
هــاتو حیلــەتــان لــەگــەل ئــەوان کــرد
ئەتـان خاتـە بـەنـد خـودای لامـەکـان

یەکسـانە بـۆ حـەق مـەکـان و زەمـان
بۆ بـێپـەیمـان و بـۆ خـاوەن پـەیمـان
تۆلــە نیـــوەشـــەو ماڵـــێ ئـــەدزی
ئــەو بــە نیــوەڕۆ ئــەتخاتــە تــەکــان

لـــێرا بــــڕاوە وتــــاری دەفتــــەر
ســەنـا بــۆ خـودا و ســەلام بـۆ رەهبـەر

بـــۆ هـــەمـــوو ئـــاڵ و هـــەمـــوو يـــارانی
بـــــۆ پـــــەيـــــرەوانـــــی رۆژگـــــارانی

دوايـــی هـــات ئـــەم دەفتـــەرە كـــە هـــۆنراوەی عبـــدالكريمی مودەڕڕيسە لە بارەگای حەزرەتی عەبدولقادری گەيلانيـدا لـە مانگی هەشتی هەزار و چوار سەد و پێنجی كۆچی

تمّ بحمد الله

## پێرست